# زانستەکانی قورئان

ئامادەکردنی: دانا جەباری

پێداچوونەوەی: دکتۆر عیماد محمّد

چاپی یەکەم

١٤٤١ ك - ٢٠٢٠ ز



# زانستەکانی قورئان

* ئامادەکردنی: دانا جەلال صابر

* پێداچوونەوەی: عیماد موحەممەد کەریم

* نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠٢٠ زایینی

* تیراژ: ١٠٠٠ دانە

* شوێنی چاپ: ناوەندی ڕێنوێن

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٢٩٠)ی ساڵی ٢٠٢٠ ی پێدراوە

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِن الحَمْدَ لله نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعينُهُ ونَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِالله منْ شُرُورِ أنْفُسنا وَمنْ سَيِّئات أعْمَالنـا، مَنْ يَهْدِه اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلِ فَلا هادِيَ لَهُ. أَشْهَدُ أنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَأشهَدُ أَنَّ مُحَمَّـداً عَبدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾ آل عمران: ١٠٢

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾ النساء: ١

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾ الأحزاب: ٧٠ - ٧١

أمّا بَعْدُ:فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيث كتابُ الله، وَخَيرَ الهَدي هَدْيُ مُحَمَّد صَلَى اللهُ عَلَيْه وَسَلَمَ وَشَرّ الأُمُورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَة بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَة ضَلالَةٌ، وَكُلَّ ضَلَالَة فِي النَّارِ.

بەناوی خودای بەخشندە و میهرەبان

سەنا و ستایشی بێپایان بۆ پەروەردگاری دلۆڤان و جوانکار، سەڵات و سەلامی بێژمار بۆ سەر گیانی پاکی سەروەری نازدار و یارویاوەرانی تاکو ڕۆژی جیاکەرەوەی ڕاست لە لار.

موسڵمانان بە درێژایی مێژوو بایەخێکی کەم وێنەیان بە قورئانی پیرۆز داوە، بە شێوەیەك دەتوانین بڵێین بەبێ دوو دڵی کتێبێك نییە لە جیهاندا وەک قورئان خزمەت کرابێت، لە میانەی ئەو خزمەتکردنەدا چەندەها زانستیان داهێناوە، ئیمامی زەرکەشی لە کتێبی (البرهان في علوم القران)دا چل و حەوت جۆری لێیان باس کردوە، ئیمامی سیوتیش لە کتێبی ( الإتقان في علوم القران)دا هەشتا جۆری باس کردوە، لەم سەردەمەو ئایندەش بێگومان ئەم زانستانە هەر لە برەو زیادبووندان، لە هەمان کات دەکرێت هەموویان دابەش بکرێن بەسەر دوو بەشدا، یەکەم: ئەو زانستانە کە ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە قورئانەوە هەیە و هەر دەرهاویشتەی ئەون، وەک: هۆکارەکانی دابەزین، زانستی مەکی و مەدەنی، دووەم: زانستەکان کە هاوبەشن لە نێوان قورئان و زانستەکانی تر، ئەمانیش دووبەشن، (أ) کۆمەڵە زانستێک کە پەیوەستن بە قورئانەوە وەک دەقێکی شەرعی کە حوکمی شەرعی لێوەردەگیرێت، لەمەدا زانستی فەرمووده هاوبەشە تیایدا، بەنموونە: زانستی فیقە، زانستی ناسخ ومەنسوخ، زانستی موحکەم و موتەشابیە، (ب) کۆمەڵە زانستێك کە پەیوەندییان بە قورئانەوە هەیە وەک دەقێکی عەرەبی، نموونەی ئەمانەش: زانستی واتاکانی قورئان، زانستی شیکردنەوەی ئایەتەکانی قورئان، هتد...

بەڵگە نەویستە کە ئەم زانست و زانیارییانە گرنگی و سوودی زۆریان هەیە، لەوانە:

١ -هۆکارن بۆ تێگەیشتن و تێڕامان لە قورئانی پیرۆز و هەڵێنجاندنی حیکمەت و مەبەستەکانی شەرع و حوکمە شەرعییەکان، بەبێ ئەم زانستانە تێگەیشتنی تەواومان

چنگ ناکەوێت، ئەوانەش دەڵێن لەم بارەوە پێویستیمان پێیان نییە بەهەڵەدا چوون و لاڕێیان گرتووە.

٢-کاریگەر و هۆکارن بۆ پەرەدان بە ڕۆشەنبیری موسوڵمانان.

٣ -شارەزایی لەم زانستانە موسڵمان پڕ چەك دەکات لەبەرهەڵستی و وەڵامدانەوەی گومانەکان کە دەرحەق بە قورئان دەوروژێنرێن.

٤ -موتاڵەکردن و بەهرەمەندبوون لەم زانستانە موسڵمان زیاتر و زیاتر پەیوەست دەکات بە قورئانەوە، بەرەو لوتکەی مرۆڤایەتی هەنگاو دەنێت و ڕازاوە دەبێت بە ڕەوشتی بەرز و هەستی ناسك و مەعریفەی پڕ سوود.

خوێنەری بە ئەمەك: ئەم کتێبەی بەردەستت خامەی گەنجێکی خوێن گەرم نەخشاندوویەتی، کۆمەڵێک زانیاری بە سوودی لە خۆ گرتووە، ئومێد دەکەم جێگای ڕەزامەندی تۆی خۆشەویست بێت.

هەروەها داواکارم لە خودای گەورە بیکاتە توێشوو و زەخیرەتی نووسەر لە ڕۆژی دوایی، لە ئێمەی هەژاریش بۆ ڕەحمەت و بەزەیی خۆی خۆش بێت لە گەڵ دایک باوکی هەموومان.


پ.د. عماد محمد کریم

مامۆستا لەزانکۆی گەرمیان


١٧ جمادی یەکەم ١٤٤١ بەرامبەر ١٢/١/ ٢٠٢٠



## پێشەکی ئامادەکار

سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ خوای پەروەردگار، وە صەلات و سەلامیش لە سەر پێغەمبەری نازدار و هاوەڵان و شوێنکەوتوانی تا ڕۆژی دوایی...

بەندە خۆم بەخۆشحاڵ دەزانم کە خوای پەروەردگار یارمەتی دام بۆ نووسینی ئەم پەرتوکە، کە زانستەکانی قورئانی پیرۆزی لەخۆگرتووە، ئەم زانستە لە گرنگترینی زانستەکانە،چونکە بریتییە لە کۆمەڵە بنچینە و بنەمایەك کە ڕێگایەکی گرنگن بۆ تێگەیشتن لە قورئانی پیرۆز،هەر لەبەر ئەوەیە پێویستە هەموو خوێندکارێکی زانستی شەرعی خۆی شارەزا بکات لەم زانستە.

بەداخەوە کتێبخانەی کوردی لە بواری زانستەکانی قورئانی پیرۆز زۆر هەژارە، ئەو بەرهەمە کەمانەش کەبەرچاو دەکەوت بەشێوەیەکی ئەکادیمی نەنووسراون، کەخوێندکاری سەرەتایی بەئاسانی بتوانێت سوودیان لێوەربگرێت.

هەرلەبەرئەوەیە لەم دەرفەتە هەوڵمداوە چەند زانستێکی گرنگ لەدووتوێی ئەم کتێبە بخەمە بەردەستی خوێندکارانی خۆشەویست، کەناکرێت خوێندکاری زانستە شەرعیەکان لێیان بێ ئاگابێت.

زانستەکانیش بریتین لەمانەی لای خوارەوە : مێژووی زانستەکانی قورئانی پیرۆز، وەحی، دابەزینی قورئان و هەنگاوەکانی، یەکەم ئایەت کە دابەزیوە، کۆتا ئایەت کە دابەزیوە، (أسباب النزول)هۆکارەکانی دابەزین، مەککی و مەدەنی، ناسخ و مەنسوخ، (المحكم و المتشابه)، کۆکردنەوەی قورئان، تەفسیری قورئان، (تفسير بلمأثور و التفسير بالرأي)، تەفسیری فوقەها، (الضمائر)ڕاناوەکان، (الخاص والعام)گشتی و تایبەت، (القصص)چیرۆکەکانی قورئانی پیرۆز، ئیعجازی قورئان، سورەتەکانی قورئان..

لەکۆتاییـــدا زۆر بەپێویســـتی دەزانـــم زۆر سوپاســـی ئەو برایـــانە بـــکەم کەئەرکـــی پێـــداچوونەوەی ئەم کتێبەیـــان گـــرتە ئەســـتۆ، وە پێـــوەی مانـــدووبوون خـــوای گەورە پاداشتی بەخێریان بداتەوە.

خـوای گەورە یارمەتی دەرمان بێت و لێمانی وەرگرتبێت و بەهیـوای ئەوەی سـوودێکمان گەیاندبێت.



## پێشەکیەك لەسەر قورئان

قورئـانی پیـرۆز: کۆتـا کتێبی خـوای گەورەیە، کە بـۆ کۆتـا پێغەمـبەری نـاردووە کە محمد (صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ)و، کۆتـایی بە کتێبەکانی پـێش خـۆی هێنـاوە و بـووە بە ڕێـبازی هەموو خەڵکی.

هەروەها خوای گەورە بەڵێنی داوە کە بیپارێزێت، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾ الحجر: ٩ واتە: ئێمە خۆمان ئەم قورئانەمان ناردووە، خۆمانیش بێگومان پارێزگاری لێدەکەین.

ئەم قـورئـانە پیـرۆزە بەرنـامەو پرۆگرامی موسـوڵمانانە، بـۆ ئەوەی ڕێنموونیـان بکـات بـۆ ڕێگای ڕاست و لەهەموو چەوتیەک بیانگەڕێنێتەوەو ببێتە قەڵغانێك بۆیان.

وە ئەم قورئـانە بەڵـگەی بەهێـزی پێغەمـبەری خـودا بـووە بە ڕووی بێـباوەڕان و نەیارەکانیـدا، چـونکە ڕاسـتی پێغەمبەرایەتـی و ڕاسـتی و دروسـتی پەیـامەکەی خـوای گەورە دەگەیەنێت.

هەروەهـا پێویسـتیەکانی دینـی ئیسـلامی لە سـەر دادەمەزرێـت، وەکـو بیروبـاوڕو پەرستشەکان و حوکم و یاساکان و ڕەوشت و ئادابەکان و زانست و زانیاریەکان.

بەهاتنی گۆڕانکاری گەورەی خستە هەموو جیهان و مێژووی مرۆڤایەتی بەگشتی.

هەربـۆیە جـێی گرنگـی پێغەمـبەری خـوداو یـاوەران و هەمـوو موسـڵمانانە، ئەم گرنگیدانەش لەخوێندنەوەو لەبەرکردن و کارپێکردن و شیکردنەوەو ڕاڤەکردنی خۆی دەبینێتەوە.



## مێژووی زانستەکانی قورئان:

### ١- لە سەردەمی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ):

لەدوای ئەوەی جبریل (علیە السلام) دێت بۆ لای پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، لە ئەشکەوتی حەڕڕا ،سورەتی (العلق)ی بۆ دادەبەزێت، پاشان پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگەڕێتەوە بۆلای خەدیجەی خێزانی ڕەزای خوای گەورەی لێبێت و، ڕوداوی ئەشکەوتی حەڕڕای بۆ دەگێڕێتەوە و، ئەو ئایەتانەی بۆ دەخوێنێتەوە کە بۆی دابەزیبوو.

پاشان خوای پەروەردگار فەرمانی پێدەکات کە بانگەوازەکەی ئاشکرا بکات و بە خەڵکی بگەیەنێت و، بانگی خەڵکی بکات بۆ دینی ئیسلام، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەست دەکات بە بانگەوازی خەڵکی و، هەندێک لەو خەڵکە موسوڵمان دەبن و دێنە ناو دینی پیرۆزی ئیسلامەوە. ئەوانەی کە موسوڵمان بووبوون لەماڵی ئەرقەمی ئەبی ئەرقەم کۆدەبوونەوە و، قورئانیان دەخوێندو پەندو ئامۆژگاریان لە ئایەتەکانی وەردەگرت، چونکە بەزمانی عەرەبیەکی پاراو دابەزیبوو کە زمانی خۆیان بوو، بەجوانی لەواتاکەی دەگەیشتن.هەر شتێکیان لا ڕوون نەبوایە پرسیاریان لە یەکتر دەکرد دەربارەی واتاکەی، چونکە هەندێکیان لە هەندێکی تریان زاناتر بوون، یان دەچوونە خزمەتی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بۆ ئەوەی بۆیان ڕوون بکاتەوە.

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە زانستەکانی قورئان هەر لەسەرەتای هەڵهاتنی خۆری ئیسلامەتیەکەوە سەری هەڵداوە، لەبەرکردن و تەفسیرکردنی قورئانی پیرۆز لەگرنگترینی زانستەکە بووە.

## ٢- زانستەکانی قورئان لە سەردەمی هاوەڵان:

ئەگەر سـەیری ژیـانی هـاوەڵان بکەیـن ڕەزای خوایـان لێ بێـت، دەبینـین زانسـتەکانی قورئانیـان لەبەر کـردووە، واتـا نەیـان نووسـیوەتەوەو کۆیـان نەکـردووەتەوە، ئەمەش لەبەر چەند هۆکارێك:

١- چونکە زۆرینەی هاوەڵان خوێندن و نووسینیان نەزانیوە، هەموو شتەکانیان لەبەر کردووە.

٢- پێداویستیەکانی نووسین کەم بووە، بەکەمی دەست دەکەوتن+.

٣- پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) فەرمـانی بە هـاوەڵان کردبـوو، جـگە لە قورئـانی پیرۆز هـیچ شـتێکی تـر نەنوسـرێتەوە، هەر شـتێکیش نوسـرابێت بسـڕێتەوە هەروەکـو دەفەرمووێت: (لا تَكْتُبُـوا عَنِى وَمَنْ كَتَبَ عَنِى غَيْرَ الْقُرْآنِ فَلْيمْحُـهُ) [1] واتە: هـیچ شـتێك لەمـنەوە مەنووسـنەوە، هەرکەسـێك شـتێکی لەمـنەوە نوسـیوەتەوە جـگە لە قورئـانی پیرۆز با بیسڕێتەوە.

<u>- لێرەدا دوو بۆچوونی جیاواز هەیە لەسەر لێکدانەوەی هۆکاری فەرموودەکە:</u>

**یەکەم:** کە ئەم بۆچوونەیـان بۆچـوونێکی مەشـهورە، دەڵـێن: هۆکاری ڕێگـری پێغەمـبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) لە هـاوەڵان لە نووسـینەوەی فەرمـوودە یـان هەرشـتێک جگە لە قورئـانی پیرۆز ئەوە بـووە کە قورئـانی پیرۆز لەگەڵ فەرمـوودە تـێکەڵ بەیەک نەکەن، دواتـر وابـزانن کە هەر یەک شـتن، بـۆیە ڕێگـری لێکـردوون جـگە لە قورئـانی پیرۆز هـیچ شتێکی تر نەنوسرێتەوە.

---

١- رواه مسلم (الزهد والرقائق/ ٣٠٠٤).

**دووەم:** هەنـدێکی تـر پێیـان وایە بـۆ ئەوە بـووە پێغەمـبەر (صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) ویستوویەتی ئەرکی بانگەوازی لەسەر هەموو هاوەڵان بێت، ئەگەر پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ڕێگەی بدایە جگە لە قورئانی پیرۆز بنوسرێتەوە، ئەوە ئەو کات زۆرینەی هـــاوەڵان نەخوێنـــدەواربوون هەنـــدێکیان نەبێـــت، بـــۆیە ئەو کـــات ئەوانەی کە نەخوێنـدەواربوون بەو شـێوەیە تێدەگەیشـتن و لێکـدانەوەیان بـۆ دەکـرد، کە کـاری بـانگەوازەکە تەنها کەوتـۆتە سەرشـانی ئەوانەی کە شـارەزای خوێنـدن و نوسـینەکەن، بـۆیە ئەو کـات کـاری بـانگەوازەکە تەسـک دەبـوویەوە تەنها لەسـەر چەنـد کەسـێک، پێغەمبەریش (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نەیویستووە ئەوە ڕوو بدات.

لەسـەردەمی هـاوەڵان، هـاوەڵان ڕەزای خوایـان لێبێـت زیـاتر پشـتیان بە لەبەرکـردن دەبەست، ئەوەش بەهۆکاری ئەوەی هاوەڵان توانایەکی چاکیان هەبووە بۆ لەبەرکردن و، ئایەتەکانی قورئانیـان لەبەردەکـردو کاریـان پێکـردووە، هەروەکو لە ئیمامی تەبەری لە ئیبنـو مەسـعودەوە ڕەزای خـوای لێبێـت دەفەرموێـت: (هەر پیاوێـک لەئـێمە ئەگەر دە ئـایەت فێر ببـوایە، لەوە دەرنەدەچـوو تـا ئەو کاتەی فێری واتـاکەی دەبـوو، وە لەخۆیـدا جێبەجێی دەکـرد)[1]، زۆرێـک لە هـاوەڵان شـارەزای تەفسـیری قـورئـان بـوون، لەوانە هەر چوار خەلیفە ڕاشیدینەکە و، ئیبنو عەباس و ئیبنو زوبەیرو ئوبەی کوڕی کەعب، زید کوری سـابیت و عبـدالله ی کوڕی مەسـعودو ئەبـو موسـای ئەشـعەری و دایکە عائیشـە ڕەزای خوای گەورە لە هەموویان بێت[2].

١- تەفسیری تەبەری / ل٨٨.

٢- د. فهد بن عبدالرحمن، دراسات فی علوم القرآن الكريم، ل ٣٢.

زۆرترینی ئەوانەی کە لێیانەوە ڕیوایەت کراوە لە تەفسیری قورئاندا: عەلی کوڕی ئەبی طالیب و ئیبنو عەباس و ئیبنو مەسعودو ئوبەی کوڕی کەعب، ڕەزای خوای گەورە لە هەموویان بێت.



## تەفسیری قورئانی پیرۆز لە سەردەمی تابعین:

دوای ئەوەی دەستکرا بە فتوحات و خاکی موسوڵمانان فراوان بوو، هاوەڵان ڕەزای خوایان لێبێت بڵاوبوونەوەو دەستیان کرد بە فێرکردنی زانست و زانیاری بەخەڵکی لەو شوێنانەی کە ئازاد کرابوو، تەفسیری قورئان و واتاکەیان فێری خەڵکی دەکرد، بەو شێوەیە زانست و زانیاری لەسەر دەستی هاوەڵان بڵاوبوویەوە و، کۆڕی قورئان فراوان بوو، پاشان واتا کردنی فەرمووده هاتە نێو قوتابخانەی تەفسیری قورئان، گرنگترینی قوتابخانەکان ئەم سێ قوتابخانەیە بوون:

**١- قوتابخانەی ئیبنو عەباس لە مەککە:** ئیبنو عەباس زاناترینی ئوممەتی موسوڵمانانەو ڕاڤەکەری قورئانە، ئەو کەسەبوو کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دوعای بۆ کردبوو، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەیفەرموو: (اللهمَ فقِههُ فی الدِین وعلمه التأويل)[1].

لە ناودارترین قوتابیەکانی: سەعیدی کوڕی جوبەیر، موجاهیدی کوڕی جەبرو عیکرەمەو تاوس و عەتائی کوڕی ئەبی ڕەباح.

**٢- قوتابخانەی ئوبەی کوڕی کەعب:** ئوبەی کوڕی کەعب ڕەزای خوای لێبێت یەکێک بووە لە نووسەرانی وەحی و، پێشەوای قورئانخوێنەکان بووە، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێی فەرمووە: (أقرؤهم أبي بن كعب)[2].

لە ناودارترین قوتابیەکانی: زەیدی کوڕی ئەسلەم و ئەبو عالیەی ریاحی و محمدی کوڕی القرظی.

---

١- مسند إمام أحمد، ج١، ل٣١٤، ئەلبانی بە صحیحی ناساندووە.

٢- ترمزی ڕیوایەتی کردووە (ج٥ /ل٦٦٤).

**٣- قوتابخانەی عبدالله ی کوڕی مەسعود:** عەبدالله ی کوڕی مەسعود یەکەم کەس بوو لە دوای پێغەمبەری خودا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە ئاشکرا قورئانی خوێند بەرامبەر بە بێباوەڕانی قورەیش، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەربارەی فەرموویەتی: (من أحب أن يقرأ القران غضا كما أنزل فليقرأه على قرأءة ابن أم عبد) [١].
واتە: هەرکەس پێی خۆشە قورئان بخوێنێت بە شێوەیەکی تەواو، بەو شێوەیەی کە نازڵبووە، با لەسەر قیرائەتی ئیبن ئوم عەبد بیخوێنێت (مەبەستی عەبدالله ی کوڕی مەسعود) بوو.

عەبدالله ی کوڕی مەسعود دەڵێت: سوێند بێت بە پەروەردگار حەفتاو ئەوەندە سورەتم لە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وەرگرتووە [٢].

لە ناودارترین قوتابیەکانی: عەلقەمەی کوڕی قەیس و مەسروقی کوڕی ئەجدەع و عومەری کوڕی شەرحەبیل و ئەبو عبدالرەحمانی سەلەمی.

ئەهلی مەککە لەئەهلی مەدینەو کوفە زاناتر بوون لە تەفسیری قورئاندا، هەروەکو ئیبنو تەیمیە (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرمووێت: لە تەفسیردا زاناترینی خەڵکی ئەهلی مەککە بوون، چونکە ئیبنو عەباس و قووتابیەکانی لێبوون، وەکو موجاهید و عەتائی کوڕی ئەبی ڕەباح و عیکرەمە، وە جگە لەمانەش، وەکو طاوس و ئەبی شەعثاء سەعیدی کوڕی جوبەیر، وە هاوشێوەی ئەمانەی لێ بوو [٣].

---

١ - مسند إمام أحمد، ج٧، ل٣٥٩.

٢- صحيح البخاري، ج٦، ل١٠٢.

٣- شيخ إبن تيمية، مقدمة في أصول التفسير.

جگە لە تەفسیری قورئان گرنگیش دەدرا بە زانستی ووشە نامۆکانی قورئان و ئەسباب نزول و ناسخ و مەنسوخ و زانستی مەککی و مەدەنی.

بەڵام زانستەکانیان نەدەنووسیەوە، بەڵکو تەنها بە وتنەوە بوو پاشان لەبەریان دەکرد.



## سەردەمی نووسینەوەی زانستەکانی قورئان:

لەم سەردەمەدا هەندێك لە زانستەکانی قورئانی پیرۆز لە بواری جیاجیا نووسرایەوە، وەکو قیرائەتەکان و ووشە نامۆکانی قورئان و ناسخ و مەنسوخ، بەڵام یەکەم جار بە کۆکردنەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەستی پێکرد کە پەیوەندیان بە تەفسیرەوە هەبوو[1].

ئەوکەسەی بۆیەکەم جار دەستی کرد بە کۆکردنەوەو نووسینەوەی بەشێک لە بەشەکانی فەرمووده: یەزیدی کوڕی هارونی السلمی(١١٧کۆچی)، شوعبەی کوڕی حەجاج(١٦٠کۆچی)، وەکیعی کوڕی جەراح(١٩٧کۆچی)، سوفیانی کوڕی عویەینە(١٩٨کۆچی)، جگە لەمانەش، هەریەک لەمانە بە سەنەد نەقڵکراوە، بەڵام هیچ یەکێك لەمانە نەگەشتۆتە دەستی ئێمە[2].

پاشان تەفسیری سەربەخۆ نوسرایەوە لەلایەن ئەم زانایانەوە: یەحیای کوڕی سەلامی بەصری(٢٠٠کۆچی)، ئیبنو ماجە(٢٧٣کۆچی)، ئیبنو جەریری تەبەری(٣١٠کۆچی)، ئەبو بەکری کوڕی مونزیری نیسابوری(٣١٨کۆچی)، ئیبنو ئەبی حاتەم(٣٢٧کۆچی)، ئیبنو حەبان(٣٦٩کۆچی)، حاکم(٤٠٥کۆچی)، ئیبنو مردویە(٤١٠کۆچی)، هەریەک لەم تەفسیرانە بە سەنەد بووە.

تەفسیری ئیبن و جەریری تەبەری ڕەحمەتی خوای لێبێت، کۆنترین تەفسیرە بە شێوەکی تەواو گەیشتبێت بە ئێمە[3].

---

١- د. فهد بن عبدالرحمن، دراسات في علوم القرآن الكريم، ل٣٧.

٢- محمد حسين الذهبي، التفسير المفسرون، ل١٤١.

٣- الدراسات، ٣٨.

**سەدەی دووەمی کۆچی:**

لەم سەدەیەدا حەسەنی بەصری ڕەحمەتی خوای لێبێت(١١٠کۆچی) لەسەر قیرائەتی نووسیوە، عەتائی کوڕی ئەبی ڕەباح(١١٤کۆچی) لەسەر (غریب القرآن)ی نووسیوە، قەتادەی کوڕی دیعامەی السدوسی(١١٧کۆچی) لەسەر ناسخ و مەنسوخی نووسیوە.[1]

**سەدەی سێیەمی کۆچی:**

ئەبو قاسمی کوڕی سەلام(٢٢٤کۆچی) لە سەر ناسخ و مەنسوخی، عەلی کوڕی مەدینی(٢٣٤کۆچی) لەسەر ئەسباب نزول، ئیبنو قوتەیبە(٢٧٦ کۆچی) (تأویل مشكل القرآن) و تەفسیری (الغریب القرآن)ی نووسیوە.

**سەدەی چوارەمی کۆچی:**

ئەبو ئیسحاق الزجاج(٣١١ کۆچی) (إعراب القرآن)، ئیبن و دەرەستەوەیە(٣٣٠کۆچی) (إعجاز القرآن)، ئەبوبەکری سجستانی(٣٣٠کۆچی) (تفسیر غریب القرآن)، ئەبو بەکری باقلانی(٤٠٣کۆچی) (إعجاز القرآن) یان نووسیوە.

**سەدەی پێنجەمی کۆچی:**

عەلی کوڕی ئیبڕاهیمی حوفی(٤٣٠کۆچی) (إعراب القرآن)، ماوردی(٤٥٠کۆچی) (إعراب القرآن)، ئەبو حەسەنی الواحدی(٤٦٨کۆچی) (أسباب النزول)، ئیبنو ناقیای بەغدادی(٤٨٥کۆچی) (الجُمان فی تشبیهات القرآن) یان نووسیوە.

---

١- الدراسات، ل٣٨.

**سەدەی شەشەمی کۆچی:**

کەرمانی(٥٠٠کۆچی) (البرهان فی متشابه القرآن)، راغبی ئەسفەهانی(٥٠٢کۆچی) (المفردات فی غریب القرآن)، ئیبنو الباذش(٥٤٠کۆچی) (الإقناع فی القراءات السبع)، سوهەیلی(٥٨١کۆچی) (مبهمات القرآن) یان نووسیوە.

**سەدەی حەوتەمی کۆچی:**

علم الدین السخاوی(٦٤٣کۆچی) (جمال القُراء وکمال الإقراء)، عیززی کوڕی عبدالسلام(٦٦٠کۆچی) (مجاز القران)، ئیبنو ئەبی ئەصبەح(٦٥٤کۆچی) (بدائع القرآن)، محمدی کوڕی ڕازی(٦٦٠کۆچی) (أسئلة و أجوبتها) یان نووسیوە.

**سەدەی هەشتەمی کۆچی:**

ئیبنول قەیم(٧٥١کۆچی) (التبیان فی أقسام القرآن)، الخراز(٧١١کۆچی) (مورد الظمآن في رسم ضبط القرآن)، الطوفی(٧١٦کۆچی) (الإکسیر فی قواعد التفسیر)، ئەبو حەیان النحوی(٧٤٥کۆچی) (لغات القرآن)، ئیبنو کەسیر(٧٧٤کۆچی) (فضائل القرآن)یان نووسیوە.

**سەدەی نۆیەمی کۆچی:**

ئیبنو حەجەری عەسقەلانی(٨٥٣کۆچی) (العجائب فی بیان الأسباب)، الکافیجی(٨٧٩کۆچی) (التیسیر فی قواعد علم التفسیر)، سیوطی(٩١١کۆچی) (مفحمات الأقران فی مبهمات القرآن) وە (لباب النقول فی أسباب النزول) یان نووسیوە.

**سەدەی دەیەمی کۆچی:**

شیهابودینی قەستەلانی(٩٢٣کۆچی) (لطائف الإشارات فی علم القراءات)، ئەبو یەحیا زەکەریای ئەنصاری(٩٢٦کۆچی) (فتح الرحمن بکشف ما یتلبس فی القرآن) ئیبنول شیحنە(٩٢١کۆچی) (غریب القرآن)، یان نووسیوە.

**سەدەی یازدەهەمی کۆچی:**

شێخ مرعی الکومی(١٠٣٣کۆچی) (قلائد المرجان فی الناسخ والمەنسوخ من القرآن)، ئەحمەد المقری(١٠٤١کۆچی) (إعراب القرآن)، ئەحمەد بەننا(١١١٧کۆچی) (إتحاف فضلاء البشر فی القراءات الأربعە عشر) یان نووسیوە.

**سەدەی دوازدەهەمی کۆچی:**

عەبدولغەنی النابلسی(١١٤٣کۆچی) (کفایە المستفید فی علم التجوید)، الجمزوری(١١٩٨کۆچی) (تحفە الأطفال والغلمان فی تجوید القرآن)، شێخ موحەممەدی کوڕی عبدالوهاب(١٢٠٦کۆچی) (فضائل القرآن) یان نووسیوە.

**سەدەی سیازدەهەمی کۆچی:**

الدمیاطی(١٢٨٧کۆچی) (رسالة في مبادئ التفسیر)، الهورینی(١٢٨٦کۆچی) (الجوهر الفرید فی رسم القرآن المجید)، ئیبنو حومەید العامری(١٢٩٥کۆچی) (الناسخ و المەنسوخ) یان نووسیوە.

**سەدەی چواردەهەمی کۆچی:**

مستەفا صادق الرافعی(١٣٥٦کۆچی) (إعجاز القرآن والبلاغة النبویة)، د. محمد عبدالله دەراز(١٣٧٧کۆچی) (النبأ العظیم)، سەید قوتب(١٣٧٨کۆچی) (التصویر الفنه في

القـرآن)و (مشـاهد القيامـة في القـرآن)، محمد حسـين زەهەبی(١٣٩٧كـۆچی) (التفسـير والمفسرون) يان نووسيوە.

ئەم كتێبانە نمونەيەك بوون لە كتێبەكانی سەدەكانی پێشوو، كە لە بوارە جياجياكانی زانســتی قورئانــدا نووســراون، جــگە لەمــانەش زۆر هەن كەنــاتوانين لەم دەرفەتە كورتەناوی هەموويان بهێنين و باسيان بكەين.

ئەم كتێبــانە هەريەكەيــان بەشــێك بــوون لە بەشــەكانی زانســتەكانی قورئــان، بە هەموويانەوە زانستەكانی قورئان پێكدەهێنن.



## پێناسەی زانستەکانی قورئان

(علـوم القـران)، زانسـتەکانی قورئـان پێکهـاتووە لە دوو ووشـەی لێکـدراو (علـوم): زانستەکان، (القـرآن): قورئـان، ئەبێت بگەڕێینەوە و بزانین هەریەک لەم دوو ووشـەیە بە جیا لە ڕووی زمانەوانی و زاراوەیی چی واتایەک دەگەیەنن، پاشانیش بە لێکدراو چی واتایەك دەگەیەنن.

ـ (علوم)زانسـتەکان: کـۆی(علم) زانسـتە، (علـم)، دژی (جهـل)ە، بە واتـای زانسـت و زانیاری دێت و، مەبەست لێی پەیبردنە بە شتێک، ڕاستیەك، یەقینێك یان ڕووناکیەکە خوای پەروەردگار دەیخاتە دڵەوە[1].

**پێناسەی (قورئان) لەڕووی زمانەوانییەوە:**

لەچاوگی (قرأ) بەواتای (تلا) خوێنراو، یان بە واتای(کۆکراوە) دێت، وەکو دەوترێت: قرَأَ يَقرَأ، قِراءَةً وقُرْآنًا، وەکو دەوتریت: غَفَرَ غَفْراً وغُفْراناً.

کەواتـا لەسـەر واتـای یەکەم: (تـلا) چـاوگە بەواتـای ئیسـمی مەفعـول دێـت، بەواتـای خوێنراو، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَوَلَمۡ يَكۡفِهِمۡ أَنَّآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡۚ ﴾ العنكبوت: ٥١

لەسـەر واتـای دووەم: بەواتـای (کـۆکراوە) دێـت، چـونکە کـۆکراوەی هەواڵەکـان و ئەحکامەکانە، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَإِذَا قَرَأۡنَٰهُ فَٱتَّبِعۡ قُرۡءَانَهُۥ ۞ ﴾ القيامة: ١٨

هەردوو واتەکە دەگونجێت و دروستە.

---

١- الدراسات في علوم القرآن، ج١، ل١٦.

هەندێ لەزانایانی زمانەوانی پێیان وایە ووشەی (القرآن) لە ئەسڵی(اشتیقاق) هەمزەی تێدا نییە(هەمزاوی) نییە، چونکە عەلەمێکی(مرتجل)سەرپێییە[1] ، بۆ ئەو ناماە ئاسمانییە بۆ موحەممەد (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دابەزیوە، وەکو تەورات و ئینجیل وایە، ئەمە بۆچوونی ئیمامی شافیعییە: واتا لەووشەی (قرأ) وەرنەگیراوە.

ئەشعەریەکان دەڵێن: لە ووشەی (قرن) وەرگیراوە، وەک دەوتریت(قرنت الشيئ بالشيئ) واتا: پاڵدانی شتێک بۆ لای شتێکی تر.ئیمامی قورتوبی دەڵێت: لە (قرائن) وەرگیراوە، چونکە ئایەتەکان هەندێکیان بەهەندێکی تریان دەچن.

بەڵام بۆچوونی یەکەم بەهێزە، کە لەووشەی (قرأ) وەرگیرابێت[2].

**پێناسەی (قورئان) لە زاراوەدا:**

هو كلام الله، المنزل على نبينا محمد (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، المعجز في لفظه ومعناه، المنقول إلينا بالتواتر، المتعبد بتلاوته.

واتە: ووتەی خوای گەورەیە، کە دابەزیوە بۆ سەر محمد (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، موعجیزەیە بە ووتەو ماناکەیەوە، گەیشتووە بەئێمە بەڕێگەیەکی (موتەواتیر)، خوێندنەوەی بەپەرستش دادەنرێت.

وشەی (کلام) لە پێناسەکەدا (جنس)ە، هەموو قسەکردنێک دەگرێتەوە، کە پاڵدراوە بۆ لای خوای پەروەردگار .هەموو کەلامێک دەڕواتە دەرەوە جگە لە کەلامی خوای

---

١- ئەم وشەیە سەرەتا بۆ مانایەك دانراوە، پاشان بۆ مانایەکی تر بەکارهاتووە بەبێ بوونی پەیوەندیەکی گونجان لەنێوانیاندا، وەکو: (جعفر)کەبەمانای جۆگەلە دێت. یان (الحارث) یان (الأسد)و زۆر ناوی تر. (علم المنطق، أثیرالدین البهری، و: محمد حسن سەرگەینێڵی).

٢. البرهان في العلوم القران/ الزركشي (ج١/ ص٢٧٨).

پەروەردگار، وەکو کەلامی مرۆڤ و جنۆکە و فریشتە، کاتێک دەوترێت (المنزل) ئەو کەلامەش دەڕواتە دەرەوە کە جارێک دانەبەزیوە، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ قُل لَّوۡ كَانَ ٱلۡبَحۡرُ مِدَادٗا لِّكَلِمَٰتِ رَبِّي لَنَفِدَ ٱلۡبَحۡرُ قَبۡلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَٰتُ رَبِّي وَلَوۡ جِئۡنَا بِمِثۡلِهِۦ مَدَدٗا ١٠٩ ﴾ الکهف: ١٠٩

یان دەفەرمووێت: ﴿ وَلَوۡ أَنَّمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن شَجَرَةٍ أَقۡلَٰمٞ وَٱلۡبَحۡرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعۡدِهِۦ سَبۡعَةُ أَبۡحُرٖ مَّا نَفِدَتۡ كَلِمَٰتُ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ٢٧ ﴾ لقمان: ٢٧

کاتێک دەوترێت: (المنزل على محمد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، ئەوانە دەڕواتە دەرەوە کە دابەزیوە بۆ پێغەمبەرانی پێش خۆی(علیهم السلام)، وەکو تەورات و ئینجیل و ئەوانیتریش....

ڕستەی: (المتعبد بتلاوته)، قیرائاتی ئاحادو فەرموودەی قودسی دەباتە دەرەوە، چونکە (المتعبد بتلاوته) واتای ئەوەیە بخوێندرێت لە ناو نوێژو وجگە لە نوێژیش بە پەرستش(عیبادەت) دەژمێردرێت، بەڵام قیرائاتی ئاحادو فەرموودەی قودسی بەم شێوەیە نیە[1].

هەروەکو ئەوەی کەلەنوێژدا دەخوێنرێت، نوێژ دانامەزرێت بەخوێندنی نەبێت، وەکو کەپێغەمبەری خوا دەفەرموێت: (لا صلاة لمن لم يقرأ بفاتحة الكتاب)[2]، بێگومان لەسەر پاداشتی خوێندنەوەشی یەکسان نین، یان خوێندنی شتێکی تر، چونکە لەسەر گەورەیی و پاداشتی خوێندنەوەی قورئان دەق هاتووە، بەمە لەخوێندنەوەی جگە

---

١. مباحث في علوم القران/ للشيخ مناع القطان (ص١٨).

٢- رواه البخاری(الآذان/٧١٤).

لەخۆی جیا دەکرێتەوە[1]، پێغەمبەری خوا(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێت(من قرأ حرفا من كتاب الله فله به حسنة والحسنة بعشر أمثالها)[2]



١ دراسات في علوم القرآن، ل٤٨.

٢- رواه الترمذى (٢٩١٠).

## ناو و سیفەتەکانی قورئان

ڕاجیایی هەیە لەنێوان زانایان ڕەحمەتی خوایان لێبێت لەسەر ژمارەی ناوەکانی قورئانی پیرۆز. بەڵام (زەرکەشی) خۆی بەتەنها(٥٥) ناوی هێناوە کەلە ئەبی معالی(عزیز بن عبدالملک المعروف) گێڕاویەتیەوە.[١] بەڵام ئێمە لێرەدا تەنها بەناوبانگترینیان باس دەکەین کەئەمانەی لای خوارەوەن:

**ناوەکانی قورئان:**

١- "القرآن"خوای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿ قٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ ١ ﴾ ق: ١

٢- "الکتاب" خوای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبۡدِهِ ٱلۡكِتَٰبَ وَلَمۡ يَجۡعَل لَّهُۥ عِوَجَاۜ ١ ﴾ الکهف: ١

٣- الفرقان" خوای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلۡفُرۡقَانَ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦ لِيَكُونَ لِلۡعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ١ ﴾ الفرقان: ١ بۆیە ئەم ناوەی لێنراوە جیاوازی دەخاتەنێوان حەق و باطل.

٤- "الذکر" خوای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ٩ ﴾ الحجر: ٩

٥- "التنزیل[٢]" خوای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٩٢ ﴾ الشعراء: ١٩٢

---

١- زرکشی، برهان، ج١، ل٢٧٣.

٢ - مباحث في علوم القرآن، ل١٧.

**سیفەتەکانی قورئان:**

خوای گەورە قورئانی بە زۆر سیفەت ناو هێناوە، کەئەمانەن:

١- " نور " خوای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُم بُرۡهَٰنٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ نُورٗا مُّبِينٗا ١٧٤ ﴾ النساء: ١٧٤

٢- و" هدى" و" شفاء" و" رحمه" و" موعظه"خوای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَشِفَآءٞ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ٥٧ ﴾ یونس: ٥٧.

٣- " مبارک" " ﴿ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ مُبَارَكٞ فَٱتَّبِعُوهُ وَٱتَّقُواْ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴾ الأنعام: ١٥٥

٤- " مبين" " ﴿ قَدۡ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٞ وَكِتَٰبٞ مُّبِينٞ ﴾ المائدة: ١٥.

٥- " بشرى" " ﴿ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ وَهُدٗى وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ البقرة: ٩٧

٦- " عزيز" ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِٱلذِّكۡرِ لَمَّا جَآءَهُمۡۖ وَإِنَّهُۥ لَكِتَٰبٌ عَزِيزٞ ٤١ ﴾ فصلت: ٤١

٧- " مجيد" " ﴿ بَلۡ هُوَ قُرۡءَانٞ مَّجِيدٞ ٢١ ﴾ البروج: ٢١

٨- " بشير" و" نذير"[١] " قَالَ تَعَالَى:﴿ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا فَأَعۡرَضَ أَكۡثَرُهُمۡ فَهُمۡ لَا يَسۡمَعُونَ ٤ ﴾ فصلت: ٤

---

١ - مباحث في علوم القرآن، ل١٨.

## وەحـــی:

مانـای وەحــی: دەگووترێـت (ووحيـت إلـيه و أوحيـت) ئەگەر قسـەت لە گەڵ یەکێکـدا کرد بە جۆرێک جگە لە ئەو کەسی تر گوێی لێ نەبێت[1].

وەحی لەڕووی زمانەوانییەکەی ئەم جۆرانە دەگرێتەوە:

١- ئیلهـام، سروشـتی و خسـتنە دڵەوە، وەکـو ئەو نیگـایەی کە بـۆ دایکی موسـا کـرا: ﴿ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَرۡضِعِيهِۖ ﴾ القصص: ٧

٢- ئیلهامی غەریزی بۆ گیانلەبەر، وەکو وەحی بۆ هەنگ: ﴿ وَأَوۡحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحۡلِ أَنِ ٱتَّخِذِي مِنَ ٱلۡجِبَالِ بُيُوتٗا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعۡرِشُونَ ﴿٦٨﴾ ﴾ النحل: ٦٨

٣- ئیشـارەی خێرا بەشێوەی ڕەمزو ئاماژە، وەکو وەحی زەکەریا بۆ قەومەکەی: ﴿ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنَ ٱلۡمِحۡرَابِ فَأَوۡحَىٰٓ إِلَيۡهِمۡ أَن سَبِّحُواْ بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا ﴿١١﴾ ﴾ مريم: ١١

٤- وەحی بەمانای ختوکەدانی شـەیتان بۆ ئادەمیزادو جوانکردنی شـەڕو کاری شـەڕئامێز لە دڵ و دەروونیدا، ﴿ وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ لِيُجَٰدِلُوكُمۡۖ ﴾ الأنعام: ١٢١

٥- ئەو نیگـایەی کە پەروەدگـار ئاڕاسـتەی فریشـتەکانی دەکـات دەربـارەی کارێـك کە ئەنجـامی بـدەن[2]، ﴿ إِذۡ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمۡ فَثَبِّتُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۚ

---

١- مباحث في علوم القرآن، ل٢٨.

٢- مباحث في علوم القرآن، ل٢٨.

﴿ سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعْبَ فَٱضْرِبُواْ فَوْقَ ٱلْأَعْنَاقِ وَٱضْرِبُواْ مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ ﴿١٢﴾ ﴾ الأنفال: ١٢

**وەحـــی لەڕووی زاراوەیـــیەوە:** وتەی خـــوای پەروەردگـــارە، کە دابەزێنـراوە بـــۆ ســـەر پێغەمبەران.

**چۆنێتی دابەزینی نیگا(وەحی) بۆ پێغەمبەران:**

پەروەردگار نیگای بۆ پێغەمبەرانی کردووە بەهۆی نێوەند.واسیتە.، یان بەبێ نێوەند.

١- بەواسیتەی جبریل (سەلامی خودای لەسەر بێت) نیگای کردووە بۆ پێغەمبەران.

٢- بەبێ نێوەند.واسیتە.نیگای بۆ کردوون، ئەمیش دەبێت بە دوو بەشەوە:

• خەو بینینـی ڕاســتگۆیانە (الرؤيــا الصــادقة)، لەخـــاتوو عائیشــەوە ڕیــوایەتکراوە فەرمـوویەتی: (أَوَّلُ مَـا بُـدِئَ بِـهِ رَسُـولُ اللَّهِ (صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) مِـنَ الْـوَحْيِ الرُّؤْيَـا الصَّالِحَةُ فِي النَّوْمِ فَكَانَ لا يَرَى رُؤْيَا إِلا جَاءَتْ مِثْلَ فَلَقِ الصُّبْحِ)[1]

واتە: سەرەتای هـاتنی نیگا بـۆ پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) بینینی خەوی ڕاسـتانە بـوو، ئەوە بـوو پێغەمـبەر (صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) هەر خەوێکی ببینـایە وەکـو گزنگی بەیان ڕوون و ئاشکرا دەهاتە دی.

•جـۆرێکی تـری وەحی پەروەردگـار لە گەڵ یەکێـك لە بەنـدە هەڵبژاردەکـانی، کە بەبـێ ناوەنـد لە پشـتی پەردەوە، بەنـدەکە لە حـاڵەتی بەخەبەریـدایەو نیگاو ئاخاوتنی ئاڕاسـتە دەکات، ئەم حـاڵەتە بـۆ پێغەمـبەر موسـا ڕوویـدا، وەکـو خـوای گەورە دەفەرموێـت: ﴿ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا ﴿١٦٤﴾ ﴾ النساء: ١٦٤

---

١ - رواه البخاري عن عائشة في الصحيح٤٩٥٦.

هەروەکـو ئەم جـۆرە نیگـایە بـۆ پێغەمـبەری خـوداش هـاتووە، کە لەشـەوی (ئیسـراو میعراجدا) ئاخاوتی لەگەڵ زاتی پەروەردگاردا کرد، خـوای گەورە دەفەرموێت:﴿ أَوْ مِن وَرَآيِ حِجَابٍ ﴾ الشورى: ٥١.[1]

**نیگای خوای گەورە لە ڕێگەی جبریل (علیه السلام):**

چۆنێتی نیگا کردنی فریشـتە بـۆ پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، ئەمەش دوو حاڵەت لە خۆ دەگرێت:

حاڵەتی یەکەم: کە لەسەر پێغەمبەری خـودا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) زۆر قـورس و گـران بووە ئەو شێوەیە بووە: کە وەکو زەڕەی جەڕەس بۆی هاتووە[2].

ئیمـامی بوخـاری ڕەحمەتـی خـوای لێبێـت لە دایـکە عائیشــەوە ڕەزای خـوای لێبێـت دەیگێڕێتەوە: هیشـامی کـوڕی حـارس پرسـی لە پێغەمـبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ووتـی: ئەی پێغەمـبەری خـودا چـۆن نیگـات بـۆ دێـت؟ پێغەمـبەر (صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) فەرمووی: هەندێ جار وەکو زەڕەی جەڕەس بۆم دێت، ئەمەیان زۆر قـورسە لەسـەرم . لە بەر گوێچکەم کۆتـایی دێت هەرچی ئاڕاسـتەم کراوە لێی حـاڵی بـووم و تێـگەیشـتووم، جاری وایـش دەبێ فریشـتەی نیگا لە شـێوەی پیاوێک دێتە لام و قسـەم لەگەڵ دەکات چیم پێ دەڵێت لێی حاڵی دەبم.[3]

---

١- مباحث في علوم القرآن، ل٣٤.

٢- مباحث في علوم القرآن، ل٣٦.

٣- صحيح البخاري/ ٢.

حاڵەتی دووەم: ئەوە بووە فریشتەی نیگا لە شێوەی پیاوێکدا هاتبێتە خزمەتی و نیگای ئاراستە کردبێت، ئەم حاڵەتە لە سەر پێغەمبەری خودا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەحاڵەتی پێشوو سوکتربوو[1]، هەر وەک عمری کوڕی خەتاب ڕەزای خوای لێبێت دەفەرموێت: (بَيْنَمَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَاتَ يَوْمٍ إِذْ طَلَعَ عَلَيْنَا رَجُلٌ شَدِيدُ بَيَاضِ الثِّيَابِ شَدِيدُ سَوَادِ الشَّعَرِ لَا يُرَى عَلَيْهِ أَثَرُ السَّفَرِ وَلَا يَعْرِفُهُ مِنَّا أَحَدٌ حَتَّى جَلَسَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَسْنَدَ رُكْبَتَيْهِ إِلَى رُكْبَتَيْهِ وَوَضَعَ كَفَّيْهِ عَلَى فَخِذَيْهِ وَقَالَ يَا مُحَمَّدُ أَخْبِرْنِي عَنْ الْإِسْلَامِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْإِسْلَامُ أَنْ تَشْهَدَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَتُقِيمَ الصَّلَاةَ وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ وَتَصُومَ رَمَضَانَ وَتَحُجَّ الْبَيْتَ إِنْ اسْتَطَعْتَ إِلَيْهِ سَبِيلًا قَالَ صَدَقْتَ قَالَ فَعَجِبْنَا لَهُ يَسْأَلُهُ وَيُصَدِّقُهُ قَالَ فَأَخْبِرْنِي عَنْ الْإِيمَانِ قَالَ أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ قَالَ صَدَقْتَ قَالَ فَأَخْبِرْنِي عَنْ الْإِحْسَانِ قَالَ أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ قَالَ فَأَخْبِرْنِي عَنْ السَّاعَةِ قَالَ مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنْ السَّائِلِ قَالَ فَأَخْبِرْنِي عَنْ أَمَارَتِهَا قَالَ أَنْ تَلِدَ الْأَمَةُ رَبَّتَهَا وَأَنْ تَرَى الْحُفَاةَ الْعُرَاةَ الْعَالَةَ رِعَاءَ الشَّاءِ يَتَطَاوَلُونَ فِي الْبُنْيَانِ قَالَ ثُمَّ انْطَلَقَ فَلَبِثْتُ مَلِيًّا ثُمَّ قَالَ لِي يَا عُمَرُ أَتَدْرِي مَنْ السَّائِلُ قُلْتُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ قَالَ فَإِنَّهُ جِبْرِيلُ أَتَاكُمْ يُعَلِّمُكُمْ دِينَكُمْ)[2].

واتە: ڕۆژێک لەگەڵ پێغەمبەری خودا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بووین، پیاوێک هاتە نێوانمان جلەکانی زۆر سپی بوو، قژی زۆر ڕەشبوو، شوێنەواری سەفەری پێوە دیار

١ مباحث في علوم القرآن، ل٣٦.

٢- صحيح المسلم / ٨.

نەبوو .تۆزاوی و ماندوو بوونی پێوە دیار نەبوو. کەس لەئێمە نەی دەناسی، تا نزیک بوویەوە لە پێغەمبەری خودا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، ئەژنۆی دەنێ بەئەژنۆیەوە و، دەستی دەخاتە سەر ڕانی و، دەڵێت: ئەی محمد هەواڵم بدەرێ دەربارەی ئیسلام........ تاکۆتای فەرموودەکە)، دوای ئەوە پێغەمبەری خودا بە ئیمامی عومەری فەرموو ئایە زانیتان ئەوە کێ بوو؟ ووتی: خواو پێغەمبەری خودا دەزانێت، فەرمووی: ئەوە جبریل بوو، هاتبوو دینەکەتان فێر بکات.

جۆرێکی تر لە نیگاکردن بۆ پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کە خۆی ئاماژەی پێ دەکات دەفەرموێت: (إنَّ رُوحَ القُدُسِ نفثَ في رُوعِي، أنَّ نفسًا لَن تموتَ حتَّى تستكمِلَ أجلَها، وتستوعِبَ رزقَها، فاتَّقوا اللهَ، وأجمِلُوا في الطَّلَبِ).[1]

واتا: جبریل خستیە ناو دڵمەوە: کەهیچ کەسێک نامرێت هەتا ڕزق و ڕۆزی خۆی نەخواو ئەجەلی تەواو نەبێ، لە خودا بترسن و داوای شتی باشی لێ بکەن و بەجوانی لێی بپاڕێنەوە.

لە ڕاستیدا ئەم فەرمودەیە ئەوە ناگەیەنێ: کە ئەو نیگا خستنە دڵە حاڵەتێکی سەر بەخۆنییە، پێدەچێ بکەوێتە چوارچێوەی یەکێک لەو دوو حاڵەتەی لە فەرموودەکەی عائیشەدا ڕەزای خودای لێبێت ئاماژەی بۆ کرا، کە فەرمووی: (فيأتيه الملك في مثل صلصة الجرس وينفث في روعه، أو يتمثل له رجلا وينفث في روعه)، وە پێ دەچێت ئەم حاڵەتی خستنی نیگا بۆ ناو دڵ بۆ غەیری قورئان بێت.

---

١- أخرجة ابن حبان في صحيحة والحاكم في المستدرك وصححة، ووافقة الذهبي وابن ماجه في سننه وغيره.

## دابەزینی قورئانی پیرۆز:

خوای پەروەردگار قورئانی پیرۆزی بە سێ هەنگاو دابەزاند:

هەنگاوی یەکەم: دابەزینی بۆ (لوح المحفوظ)، بەڵگەش لەسەر ئەوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ بَلۡ هُوَ قُرۡءَانٞ مَّجِيدٞ ٢١ فِي لَوۡحٖ مَّحۡفُوظِۭ ٢٢ ﴾ البروج: ٢١ - ٢٢

وەبوونی لە (لوح المحفوظ) ڕێگەکەی و کاتەکەی کەس نازانێت تەنها خوای پەروەردگار نەبێت.

هەنگاوی دووەم: دابەزینی لە (لوح المحفوظ) بۆ (بيت العزة) لە ئاسمانی دونیا، بەڵگەش لەسەر ئەوە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ١ ﴾ القدر: ١﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍۚ ﴾ الدخان: ٣﴿ شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ هُدٗى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٖ مِّنَ ٱلۡهُدَىٰ وَٱلۡفُرۡقَانِۚ ﴾ البقرة: ١٨٥

ئەم ئایەتانە بەڵگەن لە سەر ئەوەی کە قورئانی پیرۆز لە یەک شەو دابەزیوە، وەسفی ئەو شەوەی کردووە کەپیرۆزە و لەو ئایەتەی سورەتی دوخان و، ناوی ناوە (ليلة القدر) لە سورەتی القدر، بەشێکە لەشەوانی ڕەمەزان لەسوورەتی (البقرة). بەڵام هەمووی بەیەکجار دانەبەزیوە بۆ پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، دوای چەند ساڵێك هەمووی هاتۆتە خوارەوە، وەکو ئەم فەرموودانە ئاماژە بەوە دەکەن. داودی کوڕی ئەبی هند لە عیکرەمە لە ئیبنو عباس ڕەزای خوای لێ بێت دەفەرموێت: (أنزل القرآن

جملةً واحدةً الى سماء الدنيا ليلة القدر، ثم انزل بعد ذلك في عشرين سنة)[1]، كەوابوو قورئانی پیرۆز هەمووی دابەزیوە بۆ ئاسمانی دونیا، پاشان بە بیست ساڵ هەمووی بۆ پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دابەزیوە.

هەنگاوی سێیەم: ئەمەش لەڕێگەی جبریلەوە بووە، بە وەحی بۆ پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هاتووە.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ﴿١٩٥﴾ ﴾ الشعراء: ١٩٢ - ١٩٥

واتا: بەڕاستی ئەم قورئانە دابەزێنراوی پەروەردگاری جیهانە، جبریلی ئەمین هێنایە خوارەوە، بۆ سەر دڵی تۆ بۆ ئەوەی لە ترسێنەران بیت، بەزمانێکی عەرەبی ڕوون و ڕەوان.

قورئانی پیرۆز بە دوو نێردراو گەیشتووە بە خەڵکی، لەڕێگەی فریشتەیەکەوە کە جبریلە علیە السلام، ﴿ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴾، کە خوای پەروەدگار بە ڕوحول ئەمین ناوی بردووە، لە ڕێگەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گەیشتووە بە ئێمە.

یەکەم بەشی دابەزین:

ڕاسترین ووتە لەم بوارەدا ئەوەیە کە دەگووترێت: یەکەم بەشی نازڵ بوو لە قورئاندا: ﴿ ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ﴿١﴾ ﴾ العلق: ١

بەڵگەی ڕاست و دروست لە سەر ئەمە ڕیوایەتی بوخاری و موسلیم و هی تریشە: وەکو لە بوخاریدا هاتووە لە دایکە عائیشەوە ڕەزای خوای لێبێت: عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ،

---

١- أخرجه النسائي والحاكم والبيهقي.

أَنَّهَا، قَالَتْ: " أَوَّلُ مَا بُدِئَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ الْوَحْيِ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ فِي النَّوْمِ، فَكَانَ لَا يَرَى رُؤْيَا إِلَّا جَاءَتْ مِثْلَ فَلَقِ الصُّبْحِ، ثُمَّ حُبِّبَ إِلَيْهِ الْخَلَاءُ وَكَانَ يَخْلُو بِغَارِ حِرَاءٍ، فَيَتَحَنَّثُ فِيهِ وَهُوَ التَّعَبُّدُ اللَّيَالِيَ ذَوَاتِ الْعَدَدِ قَبْلَ أَنْ يَنْزِعَ إِلَى أَهْلِهِ وَيَتَزَوَّدُ لِذَلِكَ، ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى خَدِيجَةَ فَيَتَزَوَّدُ لِمِثْلِهَا حَتَّى جَاءَهُ الْحَقُّ وَهُوَ فِي غَارِ حِرَاءٍ، فَجَاءَهُ الْمَلَكُ، فَقَالَ: اقْرَأْ، قَالَ: مَا أَنَا بِقَارِئٍ، قَالَ: فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي، فَقَالَ: اقْرَأْ، قُلْتُ: مَا أَنَا بِقَارِئٍ، فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّانِيَةَ حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي، فَقَالَ: اقْرَأْ، فَقُلْتُ مَا أَنَا بِقَارِئٍ، فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّالِثَةَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ: ﴿ ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ۞ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِنْ عَلَقٍ ۞ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ۞ ﴾ العلق: ١ - ٣[1]

واتـا: یەکەم جـار کە نیگـا بـۆ پێغەمـبەر (صـلى الله علـيه وسـلم) دەسـتی پێکـرد، خەو بینینی ڕاسـت بـوو، ئەوە بـوو پێغەمـبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) هەر خەونێکی دەبینی وەکو گزنگی بەیان ڕوناك بـوو، پاشـان حەزی بە تەنهـایی دەکـرد، دەچـوو بـۆ ئەشـکەوتی حەڕڕا چەنـد ڕۆژو شـەو لەسـەر یەك لەوێ دەمـایەوە، کە بژێـوی لێ دەبـرا دەهـاتەوە بـۆ لای خەدیـجە ڕەزای خـوای لێبێـت سـەر لەنـوێ خـواردن و پێداویسـتی خـۆی دەبـردو دەچـووەوە بـۆ ئەشـکەوتەکە، تـا ڕۆژێك حەقی بـۆ دێـت لە حەڕڕا، فریشـتەی وەحی هـاتە لای پێی فەرموو: بخـوێنە، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) فەرمووی: پێم گـووت: من خوێنـدەواریم نـیە، بە خـۆیەوە گوشـیمی تـا وام لێهـات بێهـۆش ببـم، پاشـان بەریـدام ووتی: بخوێنە، ووتم من خوێنـدەواریم نیە، جاری دووەم بە خـۆیەوە گوشـیمی تـا تەواو تینـم بـۆ

١- بخاري/ ٣، مسلم/ ١٦٠.

هـات، ئەمجـار بەریـدام، ووتـی: بخـوێنە، وتـم مـن خوێنـدەوار نـیم، بـۆ جـاری سێـیەم بەخـۆیەوە گوشـیمی تـا تەواو هێزی لێ بـڕیم، پاشـان بەریـدام، ووتـی: ﴿ ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ۝١ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ۝٢ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ۝٣ ﴾ العلق: ١ – ٣

وە بۆچـوونێکی تـریش هەیە دەڵـێن: یەکەم ئـایەت لە قورئـانی پیـرۆز کە دابەزیبێـت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ۝١ قُمۡ فَأَنذِرۡ ۝٢ وَرَبَّكَ فَكَبِّرۡ ۝٣ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ ۝٤ ﴾ المدثر: ١ – ٤

ئامـاژە بەو ڕیـوایەتەی (بوخـاری و موسـلیم) دەکەن، کە ئەبـو سـەلەمەی کـوڕی عبدالرحمن دەیگێڕێتەوەو دەڵێت: "سَأَلْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ أَيُّ الْقُرْآنِ أُنْزِلَ قَبْلُ؟ قَالَ: يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ. فَقُلْتُ: "أَوْ اقْرَأْ؟" قَالَ جَابِرٌ: "أُحَدِّثُكُمْ مَا حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: جَاوَرْتُ بِحِرَاءٍ شَهْرًا، فَلَمَّا قَضَيْتُ جِوَارِي، نَزَلْتُ فَاسْتَبْطَنْتُ بَطْنَ الْوَادِي، فَنُودِيتُ فَنَظَرْتُ أَمَامِي وَخَلْفِي وَعَنْ يَمِينِي وَعَنْ شِمَالِي فَلَمْ أَرَ أَحَدًا، ثُمَّ نُودِيتُ فَنَظَرْتُ فَلَمْ أَرَ أَحَدًا، ثُمَّ نُودِيتُ فَرَفَعْتُ رَأْسِي، فَإِذَا هُوَ عَلَى الْعَرْشِ فِي الْهَوَاءِ يَعْنِي جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَّلَام، فَأَخَذَتْنِي رَجْفَةٌ شَدِيدَةٌ فَأَتَيْتُ خَدِيجَةَ فَقُلْتُ: دَثِّرُونِي فَدَثَّرُونِي، فَصَبُّوا عَلَيَّ مَاءً، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ۝١ قُمۡ فَأَنذِرۡ ۝٢ وَرَبَّكَ فَكَبِّرۡ ۝٣ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ ۝٤ ﴾[1] المدثر: ١ – ٤.

واتە: پرسـیارم لە جـابری کوڕی عبدالله کرد، کام بەشـەی قورئان لەپێشـدا نـازڵ بـووە، ووتـی: يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ. وتـم ئەم یـان (ٱقۡرَأۡ)؟ ووتـی: مـن ئەوەتـان بـۆ دەگێـڕمەوە کە لە پێغەمـبەرم بیسـتووە (صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) فەرمـوویەتی: مـن لە نزیـك ئەشـکەوتی

---

١- بخاري/ ٤٩٢٤.

(حەڕِا) بووم، كە لەوێ تێپەڕیم و دابەزیمە نێو شیوەكە و بانگیان كردم بۆ پێشەوەو بۆ دواوەی خۆم ڕِووانی سەیری ئەملاو ئەولای خۆم كرد كەسم نەبینی، پاشان بانگیان كردم سەیرم كرد كەسم نەبینی، پاشان بانگیان كردم و سەرم هەڵبڕِی بەرەو ئاسمان كە ڕِووانیم ئەوەو لەسەر كورسیەكەیەتی لە ئاسمان ـ واتە: جبرائیلە ، ئیتر لەرزین دایگرتم، هاتمە لای خەدیجەو پێم ووت: دام پۆشە دام پۆشە، دوای ئەوە خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ۝١ قُمۡ فَأَنذِرۡ ۝٢ وَرَبَّكَ فَكَبِّرۡ ۝٣ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ ۝٤ ﴾ المدثر: ١ – ٤.

وەڵامی ئەم فەرموودەی جابیر دراوەتەوە، بەوە: كە دەگووترێت پرسیارەكە دەربارەی دابەزینی سوورەتێك بووە بە تەواوی دابەزی بێت! ئیتر جابر ئەوە ڕِووندەكاتەوە: كەسوورەتی: [يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ] بە تەواوی دابەزیوە پێش ئەوەی سوورەتی (ٱقۡرَأۡ) بەتەواوی دابەزێت، چونكە یەكەم بەشی قورئان: كەدابەزیوە سوورەتی ((ٱقۡرَأۡ)) بووە.

بەڵگەش لەسەر ئەمە لە هەردوو صەحیحەكەدا فەرموودەیەك هەیە دووبارە لە ئەبو سەلەمەوە لە جابرەوە ڕِیوایەت كراوە، دەڵێت: سمعت رسول الله -صلى الله عليه وسلم- وهو يُحدِّث عن فترة الوحي فقال في حديثه: "بينا أنا أمشي سمعت صوتًا من السماء فرفعت رأسي فإذا الملَك الذي جاءني بحِراء جالس على كرسي بين السماء والأرض، فرجعت، فقلت: زملوني، فدثروني"، فأنزل الله: (يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّر)[1].

---

١- مسلم/ ٢٢٥.

ئەم فەرمـوودەیە ئەوە دەگەیەنێـت: کەئەم ڕووداوە دوای ڕووداوی ئەشـکەوتی حەڕڕا بـووە، یـان سـوڕەتی (المُـدَثر) دوای مـاوەیەك لەنـازڵ بـوونی نیگـا یەکەم سـوڕەتە: کەبەتەواوی نـازڵ بـووە. جـابر کە ئەو قسـەیەی کـردووە بە ئیجتیهـادی خـۆی بـووە، ڕیـوایەتی عـائیشـە ڕەزای خـوای لێبیـت لێی پێشـکەوتووە، کەوابـوو ئەوەی لەقورئـان بە ڕەهایی یەکەمجار دابەزیوە، ئەو چەند ئایەتەن کە بە (إقرأ)دەست پێدەکەن، یەکەم سـوورەتیش کە بە تەواوی دابەزیبێـت سـوورەتی (المُـدَثر)ە، یـان یەکەم بەش کە دوای نیگاکردنی سەرەتاوە ماوەیەکی پێ چووە (يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّر)ە، یان یەکەم بەشی قـورئان کە دابەزیبێت و ئەرکی پێغەمبەرایەتی خستبێتە سـەر شـانی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) سوورەتی (المُدَثر)ە، بۆ (نبوەت و نیگاش) (إقرأ باسم ربك.....)ە.

هەنـدێک بۆچـوونیتر هەیە کەپێی وایە کە یەکەم سـوورەتی قورئـان کە دابەزی بێـت سـوورەتی (فـاتیحەیە)، یـان هەنـدێکی تـر پێـیان وایە (بسـم الله الـرحمن الـرحيم)، بەڵگەی ئەم دوو بـۆ چـوونە چەنـد فەرمـوودەیەکی مورسـەلن. ئەم دوو بۆچـوونە جێی گرنگی نین.

بەڵام بۆچوونی یەکەم: کە بەفەرموودەی عـائیشـە پشـتگیری کراوە، بۆچـوونێکی بەهێزو مەشهورە[1].

کۆتا ئایەت کە لەقورئانی پیرۆز دابەزی بێت:

زانایان ڕاجوێییان هەیە لە سەر دیاری کردنی دابەزینی کۆتا ئایەت:-

بۆچـوونی یەکەم: پێیـان وایە کۆتـا ئـایەت، ئـایەتی (ڕیـبا)یە، ئامـاژە بە فەرمـوودەکەی بوخـاری دەکەن، کە لە ئیبن عەباسـەوە ڕەزای خـوای لێبێـت هێنـاویەتیەوە: ("آخـر آيـة

---

١- مباحث في علوم القرآن، ل٦٦.

نزلت آية الربا") والمراد بها قوله تعالى: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾ البقرة: ٢٧٨

بۆچوونی دووەم: پێیان وایە ئەم ئایەتە کۆتا ئایەتە: ﴿ وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا تُرۡجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِۖ ﴾ البقـــرة: ٢٨١، ئاماژە بەریوایەتی نەسائی و جگە ئەویش، لەسەعیدی کوڕی جوبەیرەوە لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوای لێبێت کە دەفەرموێت: "آخر شيء نزل من القرآن: ﴿ وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا تُرۡجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِۖ ﴾.

بۆچوونی سێیەم: پێیان وایە ئایەتی (الدَین) مەبەست پێی ئایەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيۡنٍ ﴾ البقرة: ٢٨٢

کۆکردنەوەوە لە نێوان ئەم ڕیوایەتانەدا بەمە دەبێ بڵێین: ئەم ئایەتانە بە یەك وەجبە دابەزیون، وەکو چۆن لە قورئاندا ڕیزبەند کراون (١- ربا، ٢- ئایەتی: وتقوا یوما، ٣- ئایەتی: الدین) چونکە هەرسێ ئایەتەکە لە یەك چیرۆکدا کۆبونەتەوە، ئیتر هەر ڕاویـیەك هەواڵی لە بەشێکی داوەو ووتوویەتی ئەمە کۆتا بەشی دابەزینی قورئانە، ئەمەش هیچ دژایەتی و دژیەکی تێدا نییەو ڕای ڕاستەو نەگونجان لە نێوانیاندا نیە.

بۆچوونی چوارەم: هەندێکی تر پێیان وایە ئایەتی (الكلالة) کۆتا ئایەتە: (بوخاری وموسلیم) لە بەڕائی کوڕی عازیبەوە ڕیوایەتیان کردوە، کەدەڵێت: کۆتا ئایەت کە دابەزیوە: ﴿ يَسۡتَفۡتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفۡتِيكُمۡ فِي ٱلۡكَلَٰلَةِۚ ﴾ النساء: ١٧٦

بۆچوونی پێنجەم: هەندێکی تر پێیان وایە ئەم ئایەتەیە: ﴿ لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ ﴾ التوبة: ١٢٨، لە ئوبەی کوڕی کەعب: کۆتا ئایەت کە دابەزیووە: ﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾ ﴾ التوبة: ١٢٨ تا کۆتایی ئایەتەکە[١].

بۆ چوونی شەشەم: هەندێکی تر پێیان وایە، کۆتا بەشی قورئان نازڵ بوو سورەتی (المائدة)یە.

بۆچوونی حەوتەم: هەندێکی تریش پێیان وایە ئەم ئایەتەیە: ﴿ فَٱسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ ﴾ آل عمران: ١٩٥ ئوممو سەلەمە ووتی: ئەی پێغەمبەری خودا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەوەچییە پەروەردگار هەر باسی پیاو دەکات و باسی ژن لە کولەکەی تەریش باسی نایەت؟ ئیتر ئایەتی: ﴿ وَلَا تَتَمَنَّوْا۟ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴾ النســـــــــاء: ٣٢، دابەزی، هەروەهــا: ﴿ إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ ﴾ الأحزاب: ٣٥دابەزی[٢].

بۆ چوونی هەشتەم: بۆ چوونێکی تر کە بوخاری لە ئیبنو عەباسەوە ڕیوایەتی دەکات ڕەزای خوای لێبێت، دەڵێت: کۆتا ئایەت کە دابەزیوە: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا

---

١- المستدرك/ ٣٢٩٦.

٢- أخرجه الحميدي في المسند/٣٠٣، وسعيد بن منصور /٥٥٢، وأبو يعلى في مسنده /٦٩٥٨، والحاكم /٣١٧٤، والبيهقي في معرفة السنن و الاثار/١٧٦٤٤.

﴿ مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا ٩٣ ﴾ النساء: ٩٣

دەڵێت: هیچ شتێك نەسخی نەكردۆتەوە، ئەوە دەگەیەنێت: كە ئاخیر ئایەتێك بۆ دەربارەی كوشتنی موسوڵمان بەئەنقەست هاتبێتە خوارەوە.

بۆچوونی نۆیەم: ئیمامی موسلیم لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوای لێبێت، نەقڵی كردووە، دەفەرموێت: كۆتا سورەت دابەزیوە سورەتی: ﴿ إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ١ ﴾ النصر: ١

ئەمەشیان وا ئاراستە كردووە دەڵێن: كۆتا سورەتێكە كە ئاماژەی لە دونیا دەرچوونی پێغەمبەری تێدا بێت، وەكو هەندێك لە هاوەڵان وای لێ تێگەیشت بوون، یان كۆتا سورەتە بەتەواوی دابەزی بێت.

**وەڵامدانەوەی گومانێك:**

هەندێك كەس پێی وایە ئەم ئایەتە، كەخوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ ﴾ المائدة: ٣ كۆتا ئایەتە كە دابەزیوە، كە لەحەجیماڵئاوایی دابەزیوە، بەڵام بەو شێوەیە نیە، لێرە ئایەتەكە باس لە(كامڵ)بوونی حوكمە شەرعیەكان دەكات، نەك كۆتایی بە وەحی هاتبێت.

بەڵـگەش لەســەر ئەوە: ئـایەتی تـری قورئـان لەدوای ئەو ئـایەتەوە دابەزیـوە، کەئەم ئـــــایەتەیە: ﴿ وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا تُرۡجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِۖ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا كَسَبَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿٢٨١﴾ ﴾ البقرة: ٢٨١

وەهەروەها لەسەرەتای سورەتی (المائدة) خوای پەروەردگار چەند حوکمێکی شەرعی بۆ موسوڵمانان ڕووندەکاتەوە، کە دەفەرموێت: ﴿ حُرِّمَتۡ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةُ وَٱلدَّمُ وَلَحۡمُ ٱلۡخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ وَٱلۡمُنۡخَنِقَةُ وَٱلۡمَوۡقُوذَةُ وَٱلۡمُتَرَدِّيَةُ وَٱلنَّطِيحَةُ وَمَآ أَكَلَ ٱلسَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيۡتُمۡ وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ وَأَن تَسۡتَقۡسِمُواْ بِٱلۡأَزۡلَٰمِۚ ذَٰلِكُمۡ فِسۡقٌۗ ٱلۡيَوۡمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن دِينِكُمۡ فَلَا تَخۡشَوۡهُمۡ وَٱخۡشَوۡنِۚ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ فِي مَخۡمَصَةٍ غَيۡرَ مُتَجَانِفٖ لِّإِثۡمٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٣﴾ ﴾ المائدة: ٣

کەباس لە حەرامبوونی (مردارەوە بوو و خوێن و گۆشتی بەرازو ئەوەی بۆ غەیری خودا سەر ببڕێ......) دەکات، دوای دەفەرموێت: ﴿ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ ﴾، کە مەبەســت تێـیدا ئەوەیە، کۆتـایی بە حـوکمە شەرعیەکان هاتووە، نەك کۆتایی بە وەحی هاتبێت. والله أعلم.



# هۆکارەکانی دابەزین

# (أسباب النزول)

مەبەست لەهۆکاری دابەزین، دابەزینی قورئانی پیرۆزە بەهۆی ڕووداوێکەوە.[1]

قورئانی پیرۆز هەندێکی بەبێ هۆکار دابەزیوە،دابەزینەکەی پەیوەست نیە بەڕووداوێکی دیاری کراو.، کەئەم جۆرەش زۆرینەی قورئان دەگرێتەوە . هەندێکی تر لە ئایەتەکان یان سورەتەکان بەهۆی هۆکارێکەوە دابەزیون، کە ئەو هۆکارانەش ئەمانەن:

١- پرسیار لەپێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کراوەو خوای گەورە لە ڕێگەی وەحییەوە وەڵامیانی داوەتەوە، وەکو لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە: سأل الناس رسول الله صلى الله عليه وسلم عن الأهلة، فنزلت هذه الآية: ﴿ ۞ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡأَهِلَّةِۖ قُلۡ هِيَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلۡحَجِّۗ ﴾ البقرة: ١٨٩، يعلمون بها حل دينهم، وعدة نسائهم، ووقت حجهم..

دەڵێت: خەڵکی پرسیاری کرد لە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەربارەی: (الأهلة) .مانگەکان ،. وە ئەم ئایەتە نازڵبوو: ﴿ ۞ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡأَهِلَّةِۖ قُلۡ هِيَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلۡحَجِّۗ ﴾ البقرة: ١٨٩

٢- یان بەهۆی ڕووداوێکەوە بووە کەڕوویدابێت، پێویست بووە بۆیان ڕوون بکرێتەوەو لێ ئاگادار بکرێنەوە، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَلَئِن سَأَلۡتَهُمۡ لَيَقُولُنَّ

---

١- الدراسات، ل٣٩٨.

﴿ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُۚ ﴾ التوبة: ٦٥، (عن هشام بن سعد عن زيد بن أسلم عن عبد الله بن عمر قال: قال رجل في غزوة تبوك في مجلسٍ: مارأيت مثل قرائنا هؤلاء، أرغب بطوناً، ولا أكذب ألسناً، ولا أجبن عند اللقاء، فقال رجل في المسجد: كذبت ولكنك منافق لأخبرن رسول الله صلى الله عليه وسلم، فبلغ ذلك رسول الله صلى الله عليه وسلم ونزل القرآن فقال عبد الله بن عمر: أنا رأيته متعلقاً بحقب ناقة رسول الله صلى الله عليه وسلم تنكبه الحجارة وهو يقول: يا رسول الله إنما كنا نخوض ونلعب، ورسول الله صلى الله عليه وآله وسلم يقول:﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُۚ قُلْ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ ﴿٦٥﴾ ﴾ التوبة: ٦٥،واته: له هیشامی كوڕی سەعد له له زیدی كوڕی ئەسلەم له عبدالله ی كوڕی عومەر ووتی: پیاوێك له كاتی غەزای تەبوكدا ڕۆژێك له ناو كومەڵێكدا ووتی: وێنەی ئەم قورئان خوێنانەی خۆمانم نەدیوە نە لە زۆر خۆری و ورگ تێركردن داو، نەلە درۆزنی و نە له ترسنۆكی دا لەكاتی ڕووبەڕووبوونەوەدا، پیاوێك له ناو مزگەوتەكە ووتی: درۆت كرد، بەڵكو تۆ دووڕوویت، بێگومان ئەم هەواڵە دەگەیەنم به پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، دوای ئەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: سوێند بێ ئەگەر پرسیاریان لێ بكەیت بەڕاستی دەڵێن دڵنیابن ئێمە هەر دەمەتەقێ و گاڵتە دەكەین تۆش بڵێ: ئایا بەخواو بەڵگەكانی و پێغەمبەرەكەی ئێوە گاڵتەو لاقرتێتان دەكرد ؟

٣- یان كردارێك ڕوویدابێت، پێویست بووە حوكمە شەرعیەكەی ڕوونبكرێتەوە، وەكو ئەو ئایەتەی كه خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿١﴾ ﴾ المجادلة: ١،

ئیمامی ئەحمەد و حاکم لە دایکە عائیشەوە ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕنەوە کەدەڵێت: سوپاس بۆ ئەو خوایەی هەموو قسەو دەنگێك دەبیستێت، سوێند بە خوا خەولەی کچی سەعلەبە هات بۆلای پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) .دەربارەی (ظهار)کردنی مێردەکەی شکاتی دەکرد، لەو کاتەدا من لە گۆشەیەکی ماڵەکەدا بووم گوێم لە قسەکانی نەبوو چی دەڵێ، بەو هۆیەوە خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿ قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٌ ۝١ ﴾ المجادلة: ١ کە حوکمی (ظهار)لەو سورەتەدا ڕووندەکاتەوە.

**ڕێگاکانی زانینی هۆکاری دابەزین (سبب نزول):**

هیچ ڕێگایەك نیە بۆ زانینی سبب نزول -هۆکاری دابەزین-، مەگەر ئەوە نەبێت بەڕێگەی سەنەدێکی صحیح گەیشتبێت، واحدی لە ئیبنو عەباسەوە، ووتی: پێغەمبەری خودا فەرموویەتی: (هەرکەسێك درۆ بەدەمی منەوە هەڵببەستێت با جێگەیەك بۆ خۆی دیاری بکات لە ئاگردا، وهەرکەسێك درۆ هەڵببەستێت لە سەر قورئان وەقسەی تیدا بکات بەبێ زانیاری، باجێگەیەک بۆ خۆی دیاری بکات لە ئاگردا. هەربۆیە دروست نیە بۆ کەسێک بێت و بە ئیجتیهادی خۆی قسەی تێدا بکات، مەگەر بە ڕشتە (سند)ێکی دروست لە هاوەڵانەوە ڕیوایەت کرابێت.[١]

---

١- الدراسات،ل٤٠٤.

## سودەکانی زانینی هۆی دابەزین (سبب نزول):

یەکەم:

ڕوونکـــردنەوەی ئەوەی کە ئەم قورئـــانە لەلایەن خـــوای پەروەردگـــارەوە دابەزیـــوە، لەبەرئەوەی کە پرسـیار دەکـرا لە پێغەمـبەری خـودا، هەنـدێکجار وەڵامی نەئەدانەوەو دەوەستا لەسـەری تا ئەو کاتەی کە وەحی بـۆ دەهات، یان شـتێکی بۆ ڕوون نەبوو، ئەوا وەحی بـۆ دەهـات ڕوون دەکـرایەوە، وەکـو خـوای پەروەردگار دەفەرموێـت: ﴿ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ٨٥ ﴾ الإسراء: ٨٥

لە عبـدالله ی کوڕی مەسـعودەوە ڕەزای خـوای لێبێـت: (أن رجـلاً من اليهـود قـال: يـا أبـا القاسـم ما الـروح؟ فسـكت، وفي لـفـظ: فـأمسـك النبي ـ صلى الله عليـه وسـلم ـ فـلم يـرد عـليهم شـيئًا، فعلمت أنـه يـوحى إليـه، فقمت مقـامي، فلما نزل الـوحي قـال: ﴿ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ٨٥ ﴾ الإسراء: ٨٥

پیاوێك لە یەهـود ووتی: ئەی ئەبەلقاسـم ڕوح چیە؟ پێغەمبەری خـودا بێدەنگ بـوو هیچ شـتێکی پـێ نەووت، منـیش ووتـم نیگـای بـۆ دێـت و هەسـتام، کە نیگـاکە تەواو بـوو، فەرمـــــــووی: ﴿ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ٨٥ ﴾ الإسراء: ٨٥[١]

---

١- بخاري/ ١٢٥، مسلم/ ٢٧٩٤.

دووەم:

ڕوونکـردنەوەی پشـتگیریکردنی خـوای پەروەردگـار بـۆ پێغەمـبەرەکەی، وەکـو خـوای پەروەردگـار دەفەرموێـت: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلۡقُرۡءَانُ جُمۡلَةٗ وَٰحِدَةٗۚ ﴾ الفرقــان: ٣٢ واتە: ئەوانەی کە کافرو بێباوەڕبوون دەیان ووت: بـۆچی موحەمەد (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) هەمـوو قوڕئـانی بەیەك جـار بـۆ دانەبەزێنراوە؟ ئـا بەو جـۆرە دامـان بەزانـدووە، بـۆ ئەوەی دڵی تـۆ ئەی مـوحەمەد (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) دامەزراو و بەهێز بکەین وە بەو بۆنەیەوە ئایەتەکانی خۆمم بۆ ناردن بەرەبەرە.

سێیەم:

بۆ باشتر تێگەیشتن لە قورئانی پیرۆز، هەروەکو: ابن دقیق العید: دەڵێت: (بیان سبب النزول طریق قوي في فهم معاني القرآن الکریم) [(١)].

واتە: (ڕوونکردنەوەی سەبەب نزول- هۆکاری دابەزین- ڕێگەیەکی بەهێزە بۆ تێگەیشتن لە واتاکانی قورئانی پیرۆز).

چوارەم:

ئاسانکاریـیە بـۆ لەبەرکـردن و تێگەیشـتنی قـورئـانی پیرۆز، زانینی هۆکاری ئایەتەکان و چیرۆکی ڕووداوەکان و کات و شـوێنەکانی ڕووداوەکە وادەکات لە مێشکدا بچەسپێت.[٢]

---

١- الإتقان في علوم القرآن/ السیوطي (ص: ٧١).

٢- مناهل العرفان، الزرقانی،ج١، ل١٠٦-١٠٧.

## یاسایەك:

## (عموم اللفظ و خصوص السبب):

(العبره بعموم لفظه لا بخصوص سببه)..

عیبرەت بەگشتگیری لەفزەکەیە نەك تایبەتمەندی هۆکاری دابەزینی.

ئەگەر ئایەتێك دابەزی بە هۆی هۆکارێکی (خاص) تایبەتەوە، وە لەفزەکەی (عام) . گشتیر بوو، ئەوە حوکمەکەی لە لەفزە گشتگیرەکە وەردەگیرێت، تایبەت نیە بە هۆکارە تایبەتەکەوە، بەڵکو هاوشێوەکانیشی دەگرێتەوە، وەکو ئایەتی (لیعان) شەڕە نەفرین کە دەربارەی بوختان کردنی هیلالی کوڕی ئومەییە بە ژنەکەی دابەزی.

لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوای لێبێت ڕیوایەت کراوە دەڵێت: هیلالی کوڕی ئومەییە لە خزمەت پێغەمبەری خودا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تۆمەتی زیناکردنی دایە پاڵ ژنەکەی، ووتی: لەگەڵ شورەیکی کوڕی سەممأدا زینای کردووە، پێغەمبەری خودا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێی فەرموو: شایەت بێنە لەسەر ئەم داوایەت ئەگینا داری حەد لەپشتت دەدرێت، هیلال ووتی: ئەی پێغەمبەری خودا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)! چۆن دەبێ دەگونجێ یەکێك لە ئێمە پیاو بەسەر ژنی خۆیەوە بگرێ، بچێ هەواڵ بدا شایەت پەیدا بکات بێن و ڕووداو ببینن و ئەمجار شایەتی بۆ بدەن؟ پێغەمبەری خودا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەر دەیفەرموو: شایەت بێنە، یان داری حەددی بوختانکردنت لەپشت دەدرێت، هیلال ووتی: سوێندم بەو کەسەی تۆی بە پێغەمبەر ڕەوانە کردووە من ڕاست دەکەم و ئەم خێزانەم لەگەڵ فلانـدا زینای کردووەو دڵنیام پەروەردگار حوکمێك دادەبەزێنێت، پشتی من داری حەددی بوختانی لێ نەدرێت، دوای ئەوە ئەم

ئایەتــانە دابەزی: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ وَلَمۡ يَكُن لَّهُمۡ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمۡ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمۡ أَرۡبَعُ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ٦ ﴾ النور: ٦

دەی ئەم حوکمە گشتگیرە لەم لەفزە (عام) گشتیە وەردەگیرێت و هەموو ڕووداوێکی لەم جۆرەی هیلال و خێزانەکەی دەگرێتەوە، هیچ پێویست بە بەڵگەی تر ناکات.



## ئایەتی مەککی و مەدەنی:

زانایـانی ئیسـلام سـێ ڕای جیاوازیـان هەیە لە پێناسـەکردنی مەککـی و مەدەنـی، بەم شێوەیەی لای خوارەوە:

ڕای یەکەم: ئەمەش پشـت بە زەمـانی دابەزینی ئـایەتەکە دەبەسـتێت، واتـا هەرئایەتێک یـان سـورەتێك پـێش کـۆچ کردنـی پێغەمـبەر (صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) بـۆ مەدیـنە نازڵبوو‌بێـت، ئەوا مەککیە، ئەگەر دوای کـۆچکردنی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بۆ مەدینە نازڵبووبێت، ئەگەر لەمەککەش نازڵبوبێت ئەوا هەر مەدەنییە.

ئەمەش ڕای زۆرینەی زانایانە، ئەمەیان پێ پەسەندە.[1]

ڕای دووەم: پشـت بە شـوێنی دابەزینی ئـایەتەکە دەبەسـتێت، واتـا ئەوەی لە مەکـکەو دەوروبەری مەکـکە دابەزی بێـت ئەوە مەککیـیە، ئەگەر لە مەدیـنەو دەوروبەری دابەزی بێت ئەوە مەدەنییە.

ئەم پێناسـەیەش ئایەتەکانی قورئان بە تەنها لە مەککی و مەدەنی کورت هەڵناهێنێت، لەبەر ئەوەی هەنـدێك لە ئایەتەکـان لە سـەفەردا دابەزیـون . هەروەکـو لەکتێبـی (إتقـان)ی ئیمـامی سـیوتی دا هـاتووە، کە بـاس لەو ئایەتـانە دەکـات کە لەسـەفەردا هاتوونەتە خوارەوە.

ڕای سـێیەم: پشـت بە دوانـدنی ئـایەتەکە دەبەسـتێت، واتـا ئەگەر دوانـدنەکە بـۆ دانیشـتوانی مەککە بـوو بە ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ..... ﴾ دەستی پێکـرد ئەوا مەککیە، ئەگەر

---

[1]- برهان في علوم القرآن، زركشى، ج١، ل١٨٨.

دواندنەکە بۆ ئەهلی مەدینە بوو بە ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ البقــرة: ١٠٤ دەستی پێکرد ئەوە مەدەنییە.[1]

ئەمەش پێناســەیەکی گشــگیرنیە، لەبەر ئەوەی خــۆ هەمــوو ئایەتەکـان بەو شــێوەیە دەستی پێنەکردوە تا بەو شێوەیە بناسرێتەوە.

### گرنگی زانینی مەککی و مەدەنی:

زانایان گرنگی زۆریان داوە بە مەککی و مەدەنی، چونکە بەو هۆیەوە ناسخ و مەنسوخی پێ دەناسـرێتەوە، یـان پێی دیـاری دەکرێـت، مەدەنیەکان دەبـنە ناسخ و مەککیـەکان دەبن بەمەنسـوخ، ئەمەش بەهـۆی مێژووی ئایەتەکەوەیە، چونکە ئایەتە مەدەنیەکان دوای ئایەتە مەککیەکان دابەزیون.

### چۆنیەتی ناسینەوەی ئایەتەکانی مەککی و مەدەنی:

ئەمەش دەبێت بە دوو بەشەوە:

یەکەم: بەهـۆی ڕیـوایەت کردنی هـاوەڵانی پێغەمـبەری خـودا (صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ)، کەهەندێکیان ئامادەی نازڵبوونی ئایەتەکە بوونە لەکاتی وەحی بۆ پێغەمبەری خودا.

دووەم: بەهۆی ئیجتیهادی زانایانەوە، بۆ نموونە سـەیری ئایەتەکە یان سـورەتە مەککی یان مەدەنیەکەیان کـردووە لەڕووی ڕووداوەکەوە، دوایـی هـاتوون ئایەتەکانی دواتریـان حەمل کردۆتە سـەری، ئیتر ووتوویانە ئەمە پەیوەندی بەو ڕوداوەوە هەیە ئەوە مەککیە و ئەوە پەیوەنـدی بەو ڕووداوەوە هەیە ئەوەش مەدەنیـیە، وەهەروەهـا ووتوویـانە ئەوەی

---

١- الدراسات، ل٣٧٢.

چیرۆکی پێغەمبەران بێت ئەوە مەککیە و، ئەوەی لە ئەحکامەکان پێك هاتبێت ئەوە مەدەنییە.

زانایان چەند یاساو جیاکەرەوەیەکیان داناوە بۆ ئەوەی مەککی لەمەدەنی جیابکرێتەوە:

**قاعیدەو جیاکەرەوەکانی مەککی:**

(قاعیدەکان) بنچینەکانی جیاکردنەوەی مەککی لە مەدەنی ئەمانەن:

- هەموو سورەتێك کە سوجدەی تێدا بێت، ئەوا مەککیە[1]، کە ١٤ سوجدەیەو لەسورەتەکانی: (الأعراف، الرعد، النحل، الإسراء، مريم، الحج ٢ سوجدەی تێدایە، الفرقان، النمل، السجدة، الفصلت، النجم، الإنشقاق، الأعلى).[2]
- هەموو سورەتێك کە لەفزی (کلا)ی تێدابێت، ئەوا مەککیە و لەقورئانی پیرۆزدا ٣٣ جار لەپانزە سورەتدا هاتووە.
- هەموو سورەتێك کە (يا أيها الناس....) ی تێدابێت، تەنها سورەتی حەج نەبێت کەمەککیەو کۆتاییەکەی (يأيها الذين آمنوا...)ە.
- هەموو سورەتێك کە چیرۆکی ئادەم و ئیبلیسی تێدابێت. جگە لە (البقرة).
- هەموو سورەتێك دەستپێبکات بە پیتەکانی (تهجی): واتا: الم، المص، الر، ص، ق...، جگە لەسورەتی: (البقرة، آل عمران)، چونکە بەکۆدەنگی زانایان مەدەنین، وە (الرعد) ڕاجیایی لەسەرە.[3]

---

١- سیوطي، الاتقان في علوم القرآن، ج١، ل١٧.

٢- الدراسات، ل٣٧٩.

٣- الدراسات، ٣٧٩.

•هەموو سورەتێك بە(الحمد) دەست پێبكات مەككيە، كەپێنج سوورەتە.

جياكەرەوەكانى جياكردنەوەى مەككى لە مەدەنى:

- بانگەوازى يەكتاپەرستى و بيرخستنەوەى ڕۆژى دوايى و بەهەشت و دۆزەخ و ڕووبەڕووبونەوەى موشريكانى تێدايە.
- پەردە لەسەر تاوانەكانى موشريكەكان لادەدات، وەكو تاوانى خوێن ڕشتن و خواردنى ماڵى هەتيو وە زيندەبەچاڵكردنى ئەو كچانەى كە تازە لە دايك دەبوون.
- ئايەتى كورت و ووشەكانى بەهێزن، لە ڕووى واتاوە، جەخت لەسەر ماناكان دەكەنەوە بە سوێند خواردن و بە شتى جۆراوجۆر.

**بنچينەكانى جياكردنەوەى مەدەنى لەمەككى:**

(قاعيدەكان) بنچينەكانى جياكردنەوەى مەدەنى لە مەككى ئەمانەن:

- هەموو سورەتێك كە فەرزو حدودى تێدابێت. عوروەى كوڕى زوبێر فەرموويەتى: (ماكان من حد أو فريضة، فإنه أنزل بالمدينة)[1]
- هەموو سورەتێك كە باسى دووڕووەكانى تێدابێت، جگە لە سوڕەتى (العنكبوت) كە ئەوە مەككيە.[2]
- هەموو سورەتێك كە موجادەلەى ئەهلى كتێبى تێدابێت.
- هەموو سورەتێك كە (يآأيها الذين آمنوا....) تێدابێت. سيوتى لەعەلقەمەوە لەعبداللهى كوڕى مەسعودەوە دەيگێڕێتەوە، كەدەفەرموێت: (ماكان يآيها الذين آمنوا أنزل بالمدينة،، وماكان يآيها الناس فبمكة).[1]

---

١- الزركشى، برهان، ج١، ل١٨٨.

٢- سيوطي، الإتقان في علوم القرآن، ج١، ل١٦.

• هەمـــووو ســـورەتێك بەسوێند(قســـم) دەســـتی پێکردبێـــت، ئەویـــش ســـورەتەکانی: (الصافات، الذاريات، الطور، النجم، المرسلات، النازعات، البروج، الطارق، الفجر، الشمس. الليل، الضحى، التين، العاديات، العصر)[2].

**جیاکەرەوەکانی جیاکردنەوەی مەککی لەمەدەنی:**

بـــانگەوازی یەکتاپەرســـتی و بیرخســـتنەوەی ڕۆژی دوایـــی و بەهەشـــت و دۆزەخ، وە ڕووبەڕووبوونەوەی هاوتاپەرستان(مشرك) و پوچەڵ کردنەوەی بیروباوەڕی نەفامیان و وەڵامدانەوەی بەڵگەکانیان.

**جیاکەرەوەکانی جیاکردنەوەی مەدەنی لە مەککی:**

- ڕوونکـــردنەوەی بـــواری عیبـــادەت و موعـــامەلات و حەددە شـــەرعیەکان و ڕێکخستنی خێزان و ئەحکامی میرات و جەنگ و جیهاد، وە ڕوونکردنەوەی یاساو حوکم و دەستەڵات و بابەتەکانی (تشريع) یاسا دانان.[3]
- دواندنی ئەهلی کتێب و بانگکردنیان بۆ ئیسلام.
- ئاشکراکردنی سیفاتی دووڕووەکان و، مەترسیان لە سەر دینی ئیسلام.[4]
- درێـــژی ئایەتەکـــان، بەشـــێوازێك کە شـــەریعەت دەچەســـپێنێت و ئامـــانج و مەبەستەکانی ڕووندەکاتەوە.

---

١ - سیوطي، الإتقان، ج١، ل١٧.

٢- الدراسات، ل٣٨٠.

٣ - سەرچاوەی پێشوو، ل٣٨٦.

٤ - سەرچاوەی پێشوو، ل٣٨٦.

**ژمارەی سورەتەکانی مەککی و مەدەنی:**

ژمارەی سورەتەکانی مەککی (٨٢) سورەتە، کەئەمانەن:

ڕاجیایی هەیە لەنێوان زانایان لەسەر ژمارەی سورەتە مەدەنیەکان، سیوتی لەئیبنو ئەلحەسار گێڕاپەتیەوە، کەسورەتە مەدەنیەکان(٢٠) سورەتن و، لە(١٢) سورەت دا هاوبەشن، ئەوەشی دەمێنێتەوە مەککیە کە(٨٢) سورەتن.[١]

الأنعام، الأعراف، يونس، هود، يوسف، إبراهيم، الحجر، النحل، الإسراء، الكهف، مريم، طه، الأنبياء، الحج، المؤمنون، الفرقان، الشعراء، النمل، القصص، العنكبوت، الروم، لقمان، السجدة، سبأ، فاطر، يس، الصافات، ص، الزمر، غافر، فصلت، الشورى، الزخرف، الدخان، الجاثية، الأحقاف، ق، الذاريات، الطور، النجم، القمر، الواقعة، الملك، القلم، الحاقة، المعارج، نوح، الجن، المزمل، المدثر، القيامة، الإنسان، المرسلات، النبأ، النازعات، عبس، التكوير، الانفطار، الانشقاق، البروج، الطارق، الأعلى، الغاشية، الفجر، البلد، الشمس، الليل، الضحى، الانشراح، التين، العلق، العاديات، القارعة، التكاثر، العصر، الهمزة، الفيل، قريش، الماعون، الكوثر، الكافرون، والمسد.

**ژمارەی سورەتەکانی مەدەنی (٢٠) سورەتە، کەئەمانەن:**

البقرة، آل عمران، النساء، المائدة، الأنفال، التوبة، النور، الأحزاب، محمد، الفتح، الحجرات، الحديد، المجادلة، الحشر، الممتحنة، الجمعة، المنافقون، الطلاق، التحريم، النصر.

---

١ - سيوطي، الإتقان، ج١، ل١١،

له (١٢) سورەتدا بەشدارن مەككی و مەدەنی تێدایە، کەئەمانەن:

الفاتحـة، الرعـد، الـرحمن، الصـف، التغـابن، المطففـين، القـدر، البينـة، الزلزلـة، الإخلاص، الفلق، والناس.



## ئایەتەکانی ناسخ و مەنسوخ

## (الناسخ و المنسوخ)

پێناسەی (نسخ) لەڕووی زمانەوانیدا: بە مانای (إزالة)دێت، واتا: سڕینەوە.

دەوترێت: (نسخت الشمس الظل) خۆرەتاو سێبەرەکەی لابرد، هەروەها دەوترێت: (نسخت الريح أثر المشي) ڕەشەباکە شوێنەکەی ڕۆیشتنی لەو شوێنە پڕکردەوە، دیاردەکەی نەهێشت.

هەروەها بە واتای: (نقل) گواستنەوەیش دێت، نەقڵکردنی شتێک لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، دەوترێت: (نسخت الكتاب) زانیاری ناو کتێبەکەم گواستەوە بۆ ناو دەفتەرو شتی وا، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت﴿ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾ الجاثية: ٢٩

مەبەستی ئایەتەکە: گواستنەوەی کرداری ئادەمیزادە بۆ ناو صوحوف و نامەی کردەوەکان.[1]

(نسخ) لە زاراوەدا: هەڵگرتنی حوکمێکی شەرعییە بە دەلیلی حوکمێکی شەرعی تری دوای خۆی.

بە حوکمە هەڵگیراوەکە دەوترێت: مەنسوخ، بە حوکمەکەی دوای خۆی دەوترێت: ناسخ.

**مەرجەکانی (نەسخ):**

---

١- مناع القطان، مباحث في علوم القرآن، ل ٧٠٦.

١.دەبێ حوكمە نەسخكراوەكە حوكمێكی شەرعی بێت.

٢ـ دەبێ بەڵگە لەسەر لاچوونی هەڵگێرانەوەی حوكمەكە خیتابێكی شەرعی بێت و لە دوای خیتابی حوكمە مەنسوخەكە هاتبێ، نێوانێكی زەمەنی هەبێت لە نێوانیاندا.

٣ـ نابێ ئەو خیتابەی حوكمەكەی نەسخ بۆتەوە موقەیەدو بەستراو بێت بەكاتێكی دیاریكراوەوە، وەكو خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ فَٱعۡفُواْ وَٱصۡفَحُواْ حَتَّىٰ يَأۡتِيَ ٱللَّهُ بِأَمۡرِهِۦٓۗ ﴾ البقرة: ١٠٩

حوكمی ئەم ئایەتە بەستراوە بە ئاكام و مەبەستێكەوە كە: [يَأۡتِيَ ٱللَّهُ بِأَمۡرِهِۦٓۗ]، ئەگەر هەر حوكمێك ئاوا پەیوەست بێت بە كات و ڕوداوێكەوە، نەسخ ڕووی تێناكات.[1]

**(نەسخ)، ئەبێتە چوار بەشەوە، كەئەمانەن:**

١ـ نەسخی قورئان بە قورئان: وەكو خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ ۞ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِۖ قُلۡ فِيهِمَآ إِثۡمٞ كَبِيرٞ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ ﴾ البقرة: ٢١٩، ئەمە نەسخ بووەتەوە بەم ئایەتە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٩٠ ﴾ المائدة: ٩٠

ئەم جۆرە نەسخەش بە كۆڕای زانایان دروستە.

٢- نەسخی قورئان بە سوننەت: لەسەر ئەمە دوو بۆچوونی جیاواز هەیە:

---

١- سەرچاوەی پێشوو، ل٧٠٨.

بۆچـوونی یەکەم: پێیـان وایە کە قورئـان بە سـوننەت نەسـخ نـابێتەوە، لەبەر ئەوەی قورئان بە موتەواتیر گەیشـتووە، دەلیلی قەتعین و گوماناوی نین، بەڵام سـوننەت بەو شێوەیە نیە و دەلیلی زەنییە.

وەخوای گەورەش دەفەرمووێت: ﴿ * مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ ﴾ البقرة: ١٠٦

وەسـوننەتیش لەقورئـان باشـتر نـیەو وەکـو ئەویـش نـیە، ئەمەش بۆچـونی شـافیعی و زاهیریەکانە.[١]

بۆچـــوونی دووەم: پێـــیان وایە کە ســـوننەت قورئـــان نەســـخ دەکـــاتەوە، لەبەر ئەوە سوننەتیش هەر وەحییە، بەڵگەشیان ئەو ئایەتەیە کەخوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ۝٣ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ۝٤ ﴾ النجم: ٣ - ٤

ئەمەش بۆچوونی ئیمامی ئەبوحەنیفەو مالیك و ئەحمەدە، ئیبن عوسیمین ڕەحمەتی خـوای لێبێـت دەڵێـت: نەسـخی قورئـان بە سـونەت دەکرێـت، بەڵام نمـوونەی وەهـا نەهاتووە.[٢]

---

١- سەرچاوەی پێشوو، ل٧٢٤.

٢- شـێخ ئیبنـو عوسـەیمین ئەم قسـەیەی لە کتێبەکەی: (الأصـول مـن علـم الأصـول) کـردووە، کە دیـارە ئەوکات نمـوونەی بـۆ ئەم جـۆرە نەسخە لانەبـووە، بەڵام دواتـر (دوای مـاوەیەك) هەر شـێخ خـۆی کاتێك هەمـان کتێب شـەرح دەکات، دەفەرموێـت: ئێسـتا نموونەمـان دەسـتکەوتووە بـۆ ئەو جـۆرە نەسـخەش، نمـوونەکەش ئەوەیە: دەربـارەی حـوکمی نێربـازیی، کە لەقورئانـدا دەفەرموێـت ﴿وَٱلَّذَانِ يَأْتِيَـٰنِهَا مِنكُمْ فَـَٔاذُوهُمَا﴾ النساء: ١٦ واتە: هەر یەکێك ئەو تاوانەی .لیواطی ئەنجامدا

٣ـ نەسخی سوننەت بە قورئان: ئەمەش بەکۆڕای زانایان دروستە، وە گۆڕینی قیبلەی موسوڵمانان لە (بيت المقدس) بۆ (مسجد الحرام) کە لەپێشتر بە سوننەتی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جێگیر بووبوو، خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ﴾ البقرة: ١٤٤[1]

٤- نەسخی سوننەت بە سوننەت: ئەمەش دەبێت بە چوار جۆرەوە:

- نەسخی موتەواتیر بە مەتەواتیر.
- نەسخی ئاحاد بە ئاحاد.
- نەسخی ئاحاد بە موتەواتیر.
- نەسخی موتەواتیر بە ئاحاد، بەڵام ئەم جۆرەیان لای زۆرینەی زانایان ڕەتکراوەتەوە.[2]

---

ئەوا ئازاریان بدەن، بەڵام ئەم حوکمە بەفەرمووده نەسخ بووەتەوە بە کوشتن، کە لەفەرموودە هاتووە: (مَنْ وَجَدْتُمُوهُ يَعْمَلُ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ فَاقْتُلُوا الْفَاعِلَ وَالْمَفْعُولَ بِهِ).

١- مناع القطان، مباحث في علوم القرآن، ل ٧٢٤.

٢- سەرچاوەی پێشوو، ل٧٢٦.

**جۆرەكانی نەسخ:**

ئەمەش سێ جۆرە، كەئەمانەن:

جۆری یەكەم: نەسخی تیلاوەت و حوكم پێكەوە،[1] وەكو حەدیسەكەی دایكە عائیشە ڕەزای خوای لێبێت كەدەفەرموێت: (كَانَ فِيمَا أُنْزِلَ عَشْرُ رَضعَاتٍ مَعْلُومَاتٍ يُحَرِّمْنَ، ثُمَّ نُسِخنَ بِخَمسٍ مَعْلُومَاتٍ) [(٢)]

جۆری دووەم: نەسخ بوونەوەی حوكم و مانەوەی تیلاوەت، وەكو: ﴿ ٱلْـَٰٔنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًاۚ فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُواْ مِاْئَتَيْنِۚ وَإِن يَكُن مِّنكُمْ أَلْفٌ يَغْلِبُوٓاْ أَلْفَيْنِ بِإِذْنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾ الأنفال: ٦٦

جۆری سێیەم: نەسخی تیلاوەت و مانەوەی حوكمەكەی، وەكو ئەو ئایەتەی ڕەجم كە خوای گەورە دەفەرموێت: [الشّيْخُ والشَّيْخَةُ اذَا زَنَيَا فَارْجُمُوهُمَا البَتَّةَ نَكَالًا مِنَ اللهِ وَاللهُ عَزِيزٌ حكيم].[3]

**حیكمەتەكانی بوونی نسخ:**

١- ڕەچاوكردنی بەرژەوەندی بەندەكان.

٢- گەشەكردنی تەشریع و بەرەو پێشەوەچوونی بۆ پلەی كەمال، بەپێی بەرەوپێشچوونی بانگەوازەكەیەوە، پێشكەوتنی بارودۆخی خەڵكەكە.

---

١- سەرچاوەی پێشوو، ل٧٢٧

٢- مسلم/ ١٤٥٢.

٣- مناع القطان، مباحث في علوم القرآن، ل ٧٣٠.

٣- تـاقیکردنەوەی مـوکەلەف و دەرخسـتنی ئەوەی ئـاخۆ پابەنـدی حـوکمەکەیە؟ یـان سەرپێچی دەکات؟

٤- دابینکردنی خێرو ئاسانکاری بۆ موسوڵمانان، چونکە نەسخ ئەگەر لە ئاسانەوە بۆ قورس و گران بێت، ئەوە زێدە پاداشت. سەوابی .گەورەتر دەستەبەر دەکات، ئەگەر لەگرانەوە بۆ ئاسان بوو، ئەوە ئەرکی سەرشانیان سوك و ئاسان دەکات.[١]

.

١- سەرچاوەی پێشوو، ل٧٣٥-٧٣٦.

## موحکەم و موتەشابیهی قورئان

## (المحكم والمتشابه)

پێناسەی(موحکەم) لە ڕووی زمانەوانییەوە: بەواتای: منع .ڕێگری .دێت.[1]

لە (حكمت الدابة وأحكمت)وەرگیراوە، واتا: ئەگەر لغاوت کردە دەمی ئاژەڵەکە، ڕێگریت کرد لەوەی کە ڕابکات و لە دەستت بچێت .

(إحكام الكلام): وتەی جوان و ڕاست و جیاکراو لەدرۆ.

وەکو خوای پەروەردگار وەسفی قورئانی پیرۆزی بەوە کردووە کە: ئایەتەکانی موحکەمن، وەکو دەفەرموێت: ﴿ كِتَٰبٌ أُحۡكِمَتۡ ءَايَٰتُهُۥ ﴾ هود: ١، وە: ﴿ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡحَكِيمِ ۝١ ﴾ یونس: ١ کەوابوو قورئان هەمووی موحکەمە، واتا کەلامێکی تۆکمەو ڕاست و ڕەوان و ڕاستوێژو جیاکەرەوەی نێوان حەق و ناحەق و ڕاست و درۆیە، ئەمە بریتییە لە حوکمی گشتی قورئان.

پێناسەی (متشابه) لەڕووی زمانەوانییەوە: لە (شبه) وە وەرگیراوە، وەکو دەوترێت: (فلان يشبه فلانا) فلان هاوشێوەی .لێکچوی .فلانە، کەبەمانای لێکچوونی شتێک لە شتێک بکات.

الشبه: ئەوەیە کە دووشت یان زیاتر لە یەک بچن، بە هۆی لەیەکچوونیان لە یەکتر جیانەکرێنەوە.[2]

---

١- الدراسات،١١٦٥.

٢- سەرچاوەی پێشوو، ل١١٦٧.

خـوای پەروەردگار دەفەرموویّت: ﴿ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ كِتَٰبٗا مُّتَشَٰبِهٗا ﴾ الزمـــر: ٢٣ بەم پێیە قورئان هەمووی موتەشابیهە، هەندێکی دەشوبهێتە هەندێکی، لە کەمال و جەودەت و چـاکی و بەهێزیـدا، هەنـدێکی هەنـدێکی تـری بەڕاسـت دەخـاتەوە، لە مانـاو مەفهومدا، چونکە هاوشێوەن، ئەمە تەشابوهو لێکچوونە بە گشتی.

کەواتە هەریەک لە مـوحکەم و موتەشابیهـ بەم مانـا گشـتیەی پێشـەوە، دژایەتـی لەنێوانیـان نیـیە، هیچیـان مانـای ئەوی تـر هەڵناوەشـێنێتەوە، هەرچەنـدە جیـاوازی لە لەفـزەکەدا هەیە، کەوابـوو ئەو دوو ئـایەتە هـیچ دژایەتـیەك لە نێوانیانـدا نیـیە و، ئایەتەکانی قورئان هەموویان لەسەر یەکتر ڕاستی و دروستی یەکتر دەسەلمێنن، وەکو خـوای گەورە دەفەرمووێـت: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَۚ وَلَوۡ كَانَ مِنۡ عِندِ غَيۡرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ ٱخۡتِلَٰفٗا كَثِيرٗا ٨٢ ﴾ النساء: ٨٢

خـوای پەروەردگـار لەم ئـایەتەدا قورئـانی پیـرۆز هەنـدێکی بە مـوحکەم و هەنـدێکی بە(موتەشابیهـ) نـاو بـردووە، وەکـو دەفەرمووێـت: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞ﴾ آل عمران: ٧

(آیـــات محکمـــات) لەم ئـــایەتەدا: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞ﴾ آل عمـران: ٧، ئەو ئایەتانە دەگرێتەوە کە واتـاکەی ڕوون و ئاشـکرایە، وەکـو: ﴿ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱرۡكَعُواْ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ٤٣ ﴾ البقرة: ٤٣ پێویسـت بە ئایەتی تـر ناکات بۆ ڕوونکردنەوەی، بەڵام

[وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٌ]، ئەو ئایەتانە دەگرێتەوە کە واتاکەی ڕوون نیە، زۆرینەی خەڵکی واتاکەی نازانن تەنها زانایان نەبێت، واتاکەی پێویست بەئایەتی تر دەکات بۆ ڕوونکردنەوەی.

وەکو خوای پەروەردگار فەرمووی: ﴿ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٌۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۖ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٧ ﴾ آل عمران: ٧

(مُتَشَابِهَاتٌ)، لێرەدا بە واتا گشتیەکەی نا، کە لەپێشدا باسمان کرد.

پێویست ئەکات باشتر لەمانای ئەو ئایەتانە تێبگەین و تێبفکرین کەموتەشابیهە، هەروەها واتا ناکرێت کە واتاکەی پێچەوانەی قورئان بێت، بەشێوەیەک کەببێتە هۆکاری دووبەرەکی، ئەوانەی هەڵدەستن بەم جۆرە کارە، خوای پەروەردگار بە فیتنەچی ناوزەندی کردوون، پێویستە لەسەر موسوڵمانان شوێنی موحکەمەکان بکەون، کە بریتین لە ئەحکامە شەرعیەکان. وە موتەشابیهیش ئەو ئایەتانە دەگرێتەوە، وەکو: (الم، الر، یٚ، یس، ق........) یان ئایەتە (کەونیە قەدەریەکان)، هەروەکو خوای گەورە یەهودی تاقی کردەوە بەو ئایەتانە، کە ڕاوکردنی لە ڕۆژی شەممان لێ قەدەغەکردن لە ڕۆژەکانی تردا بۆی حەڵاڵ کردن، بەڵام لە ڕۆژی شەممان ماسیەکان زۆرتر بوون و دەهاتنە سەر ئاوەکە، کەچی لە ڕۆژەکانی تردا بەو شێوەیە نەبوو، ئەوانیش فەرمانی خوای پەروەردگاریان شکاند دەستیان کرد بە فێڵکردن، خوای گەورەش توشی سزای خۆی کردن، بەپێچەوانەی هاوەڵانی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، کە خوای

گەورە تــاقی بکردنــایەتەوە پابەنــد دەبــوون بەفەرمــانی خــوای پەروەردگــار، وەکــو دەفەرموویت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَيَبۡلُوَنَّكُمُ ٱللَّهُ بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلصَّيۡدِ تَنَالُهُۥٓ أَيۡدِيكُمۡ وَرِمَاحُكُمۡ لِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ مَن يَخَافُهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ ﴾ المائدة: ٩٤

**پێناسەی موحکەم و موتەشابیە لەڕووی زاراوەییەوە:**

زانایان لە پێناسەکەی ڕاجیاییان هەیە، وە بەم شێوەیە پێناسەیان کردووە:

١- موحکەم: ئەوەیە کەیەك مانای هەبێت، ئیحتیمالی مانای تری نەبێت.[١]

موتەشابیە: ئەوەیە ئیحتیمالی چەند ماناو مەفهومی جیاجیای هەبێت.

٢- موحکەم: ئەوەیە مەبەستەکەی بزانرێت و ئێمە تێیبگەین.[٢]

موتەشابیە: ئەوەیە خودا بۆ خۆی بزانێ چییەو ئێمە لێی حاڵی نەبین.

٣- مـوحکەم: ئەوەیە مانـاکەی سـەربەخۆ بێـت و پێویسـتی بە بەیـان و ڕوونکـردنەوەو لێکۆڵینەوە نەبێت.

موتەشـابیە: ئەوەیە مانـای سـەربەخۆی نەبێ و ڕاسـتەوخۆ لێی حـاڵی نەبـین، بەڵکـو پێویستی بە بەیان و ڕوونکردنەوە هەبێت[٣].

٤- مـوحکەم: ئەوەیە کـاری پێـدەکرێت، موتەشـابیە ئەوەیە ئیمـانی پـێ بهێنی، کـاری پێنەکەی.ئەمەش ووتەی ئیبنو عەباسە خوا لێی ڕازی بێت.[٤]

---

١- الدراسات، ١١٧٣.

٢- سەرچاوەی پێشوو، ١١٧٢.

٣- ئەمە ووتەی ئیمامی ئەحمەدە، الدراسات، ل١١٧٣.

٤- سیوطي، الإتقان في علوم القرآن، ج١، ل٤.

٥- موحکەم: حوکمەکان لەخۆدەگرێت، موتەشابیهـ: هەواڵ و چیرۆکەکان لەخۆدەگرێت.[1]

موتەشابیهیش وەکو: ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ۝٥ ﴾ طه: ٥

﴿ كُلُّ شَيۡءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجۡهَهُۥۚ ﴾ القصص: ٨٨

﴿ وَهُوَ ٱلۡقَاهِرُ فَوۡقَ عِبَادِهِۦۚ وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ۝١٨ ﴾ الأنعام: ١٨

﴿ يَدُ ٱللَّهِ فَوۡقَ أَيۡدِيهِمۡۚ ﴾ الفتح: ١٠

(الم، الر، ق، ص.........)، وەلەم نموونانە دەستیان پێکراوە، هەروەها چۆنێتی ڕۆژی قیامەت و زانیاری ڕابوونی.

مامۆستا ناسری سوبحانی ڕەحمەتی خوای لێبێت، بەم شێوەیە پێناسەی کردووە: (محکم) ئەوەیە کە تەنها یەك واتا دەگەیەنێت و گومانی تێدا نیە، یانی لە لایەنی دیلالەتی زمانەوانی و موفرەدات و پێکهاتە و ڕستەبەندی و سیاقەوە، ئەوە مەبەستە لە موحکەم. بەڵام (متشابە): ئەوەیە کە واتایەک دەگەیەنێت، بەڵام ئەگەری واتایەکی تریشی هەیە، کە لەگەڵ ئەودا گونجاو نییە، دەی ئەو کات دەبێت حەکمیەت ئەبێ بەکام بدرێ؟ دیارە ئەولەویەت ئەدرێ بە موحکەماتەکە،......[2].



١ - الدراسات، ١١٧٤.

٢- ناسخ و مەنسوخ/ لا: ٦٥.

## کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆزو ڕێکخستنی ئایەتەکانی

کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز بە سێ قۆناغ تێپەڕدەبێت:

قۆناغی یەکەم: کۆکردنەوەی لەسەردەمی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

قۆناغی دووەم: کۆکردنەوەی لەسەردەمی ئەبو بەکری صدیق ڕەزای خوای لێبێت.

قۆناغی سێیەم: کۆکردنەوەی لەسەردەمی عوسمانی کوڕی عەففان ڕەزای خوای لێبێت.[1]

**قۆناغی یەکەم:** قورئانی پیرۆز بە بیست ساڵ دابەزیوە بۆ پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وە قورئانی پیرۆز بەش بەش دابەزیوە، وە ئەمەش ئاسان بووە بۆ پێغەمبەری خوا، وە هاوەڵانی بۆ ئەوەی بە ئاسانی لە بەری بکەن.

پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، یەکەم کەس بووە کە قورئانی پیرۆزی لە بەرکردووەو پاراستوویەتی و ئەو هاوەڵانەش کە بە بەردەوام لە گەڵی بوون.

هەر بەوەش نەوەستان کە بەس لەبەری بکەن، هەستان بەنووسینەوەی قورئانی پیرۆز، چەند هاوەڵێکی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کە بە نووسەری وەحی ناسرابوون،کە چوار خەلیفەکە، زەیدی کوڕی سابیت، ئوبەی کوڕی کەعب، مەعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان، یەزیدی کوڕی ئەبوسوفیان، خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاس، حەنزەڵەی کوڕی ڕەبیع، زوبێری کوڕی عەوام، عامری کوڕی فەهیر، عەمری کوڕی عاس، عەبدوڵای کوڕی ئەرقەم، موغەیرەی کوڕی شوعبە، عبدوڵای کوڕی ڕەواحە، خالیدی کوڕی وەلید، سابیتی کوڕی قەیس، وەحیان دەنووسیەوە[2]، لە

---

١- الدراسات، ل٢٠٩.

٢ - ابن الحزم، جوامع السيرة، ل٢٦-٢٧.

سەردەمی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ)، کەرەستەی نووسین کەم بوو، قورئانی پیرۆز لەسەر پەلکی دارخورماو خشت و پێستەی خۆشەکراو و وە ئێسکی ئاژەڵان، شێوازی ئەم کۆکردنەوەیەش زەیدی کوڕی حارس دەیگێڕێتەوە: (کنا عند رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نولف القران من الرقاع) واتە: ئێمە لەخزمەت پێغەمبەری خوادا لەسەر پێستە قورئانمان دەنوسیەوە،[1] بەم شێوەیە لە سەرەتادا قورئان نووسراوەتەوە.

**قۆناغی دووەم:** کۆکردنەوەی لە سەردەمی هاوەڵی بەڕێز ئەبوبەکری صدیق ڕەزای خوای لێبێت، کۆکردنەوەی هەموو ئەو ئایەتانەبوو کەنوسرابوونەوە لەسەر ئێسقان و پەلکی دارخورماو پارچەدارو خشتی سوورکراو دانانیان لە تەنها جێگەیەک.

ساڵی دوانزەی کۆچی غەزای ئەهلی یەمامە ڕوویدا، ئەو لەشکرەی نێردرا بۆ سەریان ژمارەیەکی زۆری لە هاوەڵانی (حافظ القرآن)، قورئان لەبەریان تێدا بوو، لەم غەزایەدا حەفتا لە هاوەڵان کە قورئانیان لە بەربوو شەهید بوون، ئەم ڕووداوە عومەری کوڕی خەتابی ڕاچەڵەکاندو ترساندی، چووە لای ئەبوبەکری صدیق ڕەزای خوایان لێبێت، پێشنیاری ئەوەی بۆ کرد کە قوڕئان کۆبکرێتەوەو لە یەک موسحەفدا بنوسرێتەوە، نەوەکوو بە شەهیدبوونی ژمارەی تر لە هاوەڵان کە قوڕئانیان لەبەرە، قوڕئان لێی بفەوتێت، چونکە بێ گومان شەهیدبوونی هاوەڵان لەو شەڕەدا زۆر کاریگەرو ترسناک بوو، ترسی ئەوە هەبوو لەشوێنی تر هاوەڵی تر شەهید بن و قوڕئان لێی بفەوتێت، یان لەبیر بچێتەوە، سەرەتا ئیمامی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) بەو کارە ناڕازی بوو، بەلایەوە زۆر قورس و گران بوو کارێک بکا، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ژیانیدا

---

[1] - رواه الحاكم في المستدرك، ج٢، ل٢٢٩.

نەیکـردووە، بەڵام ئیمـامی عـومەر ڕەزای خـوای لێبێـت کـۆڵی لێ نەداو ئەم پێشـنیارەی ناوەناوە بۆ دوبارە دەکردەوە، هەتا خـودا خستیە دڵی ئەبوبەکر: کە ئەم کارە پێویستە ئەنجـام بـدرێ و پێشـنیارەکەی عـومەری ڕەزای خـوای لێبێـت جێبەجێ بکریـت، پاشـان ناردی بەشوێن زەیدی کوڕی سابیت دا: کە جێگەو مەقامی لەبواری قورئان لەبەربوون و نوسینەوەیدا بەرزو بەرچاو بـوو، تێگەیشـتن و عەقڵی ناوازەبوو، لەناو قورئان لەبەر کەرانیشــدا دوا کەس بــوو: کە قورئــانی بەســەر پێغەمــبەر (صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) خوێندبووەوە، ئیتر کەزەید هات ئەبوبەکر ڕەزای خوای لێبێت پێشنیارەکەی عومەری ڕەزای خوای لێبێت بۆ باس کرد، زیدیش وەکو هەڵوێستی سەرەتای ئەبوبەکر ئەوکارەی ڕەتکـردەوە و پێی وابـوو نـابێ شـتی وابکرێـت، بەڵام هەردووکیـان بیریـان لێی کـردەوەو بابەتەکەیـان دەندەشـەکرد لەنـاو خۆیانـداو دڵیـان گـۆڕاو هـاتنە سـەر ڕاکەی عـومەر بڕیاریاندا کارەکە دەست پێ بکرێت.

کەئەبوبەکری صدیق ساڵی سیانزەی کۆچی لە دونیا دەرچوو، ئەو نوسخە موسحەفە کەوتە لای ئیمامی عومەر ڕەزای خوای لێبێت، کە ئیمامی عومەر شەهید بوو، کەوتە لای حەفسەی کچی ئیمامی عومەر ڕەزای خوایان لێبێت، کە ئیمامی عوسمان بوو بە جێنشین پاش ماوەیەک داوای لەخاتوو حەفسەکرد کە نوسخە قورئانەکەی تەسلیم بکات ئەویش تەسلیمی کرد.

**قۆناغی سێیەم**: کۆکردنەوەی لە سەردەمی ئیمامی عوسمان ڕەزای خوای لێبێت، کە لەم سـەردەمە فتوحـاتی ئیسـلامی بەر فـراوان بـوو، جیـاوازی کەوتە نێـوان خەڵکـی لەسـەر شـێوازی خوێنـدنەوەی قورئـانی پیرۆز،هەروەکـو بوخـاری لە ئەنەسـەوە دەگێـڕێتەوە کە حـوزەیفەی کـوڕی یەمـان سـەردانی عوسـمانی کـرد ڕەزای خـوا لە

هەموویان بێت، حوزیفە لە غەزای ئەرمنینەو غەزای ئازربایجاندا بەشدار بوو لەگەڵ ئەهلی عێراق، حوزەیفە لە جیاوازی خوێندنەوەی قورئان مەترسییەکی گەورەی بۆ دروست بوو، بۆیە بە ئیمامی عوسمانی ووت: فریای گەلی موسوڵمانان بکەوە پیش ئەوەی وەکو جولەکەو نەسارا لە نامەی خودادا کێشەیان لێ پەیدا بێت، ئەویش خێرا ناردی بۆ لای خاتوو حەفسە، داوای لێکرد کە قورئانەکەی کاتی خۆی بە فەرمانی ئەبوبەکری سدیق ڕەزای خوای لێبێت کۆکرابووەوە، پاشان کەوتبووە لای ئەو، بۆیان بنێرێت، تا چەند نوسخەیەکی لە بەر بنوسنەوە دوای بۆی بگێڕنەوە ! خاتوو حەفسە دەست بەجێ نوسخەکەی بۆ نارد، ئیتر ئیمامی عوسمان ڕەزای خوای لێبێت، فەرمانی بە زەیدی کوڕی سابیت و عەبدوللە ی کوڕی زوبەیرو سەعیدی کوڕی عاص و عەبدورەحمانی کوڕی حارسی کوڕی هیشام کرد کە چەند نوسخەیەکی لەبەر بنوسنەوە، ئیمامی عوسمان ڕەزای خوای لێبێت بە سێ نوسەرە قورەیشییەکانی فەرموو: ئەگەر ئێوەو زەید لە ووشەو ڕستەیەکی قورئان کێشەیەکتان لێ پەیدابوو، بە زاراوەی قورەیش بینوسنەوە، چونکە قورئان بەشێوە زاراوەی ئەوان دابەزیوە، ئەوانیش پەیڕەوی فەرمایشتەکەیان کرد، کەلە نوسینەوەی نوسخەکان بوونەوە، ئیمامی عوسمان موسحەفە کۆنەکەی گێڕایەوە بۆ خاتوو حەفسە.

ئەمجار بۆ هەر وڵاتێکی ئیسلامی، نوسخەیەکی لەو موسحەفە نوسراوانە ناردو فەرمانی کرد هەموو سەحیفەو موسحەفێکی تر جگە لەو نوسخە تازە نوسراوانە هەموویان بسوتێندرێن.

زەید دەڵێت: لەکاتی نوسینەوەدا، ئایەتێکم لە سورەتی ئەحزاب لێ دیار نەما، بۆ خۆم ئەو ئایەتەم لە پێغەمبەر (درودی خوای لە سەر بێت) بیستبوو دەیخوێندەوە، هەوڵی

دۆزینەوەیمانـدا، لای خـوزەیمەی کـوڕی سـابیتی ئەنسـاری دەسـتمان کەوت، کە ئەم ئـایەتە پیرۆزە بـوو: ﴿ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾ ﴾ الأحـــــزاب: ٢٣ ئیتر لەشـوێنی خـۆی لەسورەتەکەیدا دامان نا.[1]

## جیاوازی لە نێوان کۆکردنەوەکەی ئەبوبەکری صدیق و ئیمامی عوسمان (خوا لێیان ڕازی بێت):

کۆکردنەوەی قـورئـانی پیرۆز لە لایەن ئەبـوبەکری صـدیق ڕەزای خـوای لێبێـت، هۆکاری ئەوە بوو ترسی لە ناوچوونی هەموو یان هەندێك لەقورئانی پیرۆزی هەبوو، هۆکاری ئەو ترسەشی ئەوە بوو، کە هاوەڵێکی زۆری پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، شـەهیدبوون لە جەنگی یەمـامە، کە هەڵگری قـورئـان بـوون و قـورئـانی پیرۆزیـان لەبەربـوو، هەربـۆیە هەمووی کۆکردەوەو لەشـوێنێکی تایبەت داینا.

بەڵام کۆکردنەوەی قـورئانی پیرۆز لەلایەن ئیمامی عوسـمان خـوا لێی ڕازی بێـت، هۆکاری ئەوە بـوو ڕاجیـایی(ئیختیلاف)ێکی زۆر کەوتە نێـوان موسـوڵمانانەوە لەسـەر شـێوازی خـوێندنەوەکەی، کە هەریەکەو ئەوەی خۆی بەدروست دەزانی، ئیمامی عوسمانیش بۆ ئەوەی دوبەرەکی لەنێوان موسوڵمانان دروست نەبێت، هەستا بەکۆکردنەوەی.

کۆکردنەوەی قورئـان لەلایەن ئەبـو بکـری صـدیق ڕەزای خـوای لێبێـت، بریتی بـووە لە: کـۆکرنەوەی هەمـوو ئەو پـارچە نوسـراوانە، کە لەسـەر پێسـتی ئـاژەڵان و خشـت و ئێسـقان نوسـرابوون و دواتـر گواسـتنەوەیان بـۆ نـاو موسـحەفێك، کە هەر حەوت

١- بوخاری/ ٤٩٨٧،٤٩٨٨.

پیتەکە(حــروف الســبعة)[1] ی لەخــۆ گرتبــوو کە قورئــانی پــێ دابەزیبــوو، بەڵام کۆکردنەوەی ئیمامی عوسمان خوا لێی ڕازی بێت بریتی بووە لە: نووسینەوەی لەسەر یەك (حرف)و پشتگوێ خستنی (حرف)ەکانی تر، بۆ ئەوەی موسوڵمانان یەک بخات و دووبەرەکی لەنێوانیان دروست نەبێت، لەسەر شێوازی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز.



١- ئیبنوعەباس لەپێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی : " أقرأني جبريل على حرف فراجعته فزادني فلم أزل أستزيده ويزيدني حتى انتهى على سبعة أحرف " . رواه البخاري ( ٣٠٤٧ ) ومسلم ( ٨١٩ ) .

## تەفسیری قورئانی پیرۆز:

تەفسیر لەڕووی زمانەوانییەوە: چاوگە، لە (فسر) وەرگیراوە، لەسەر سیغەی (تفعیل) هاتووە، وە (فسر) بەواتای: ڕوونکردنەوەو دەرخستن دێت، دەوترێت: (الإبانة وكشف المغطي كالتفسير)) ئاشکراکردن و هەڵماڵینی داپۆشراوێک.:﴿ وَلَا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئْنَاكَ بِالْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا ﴿٣٣﴾ ﴾ الفرقان: ٣٣[1]

تەفسیر لەڕووی زاراوەییەوە: بریتییە لە ڕوونکردنەوەی واتای قورئانی پیرۆز.

ئیمامی زەرکەشی دەڵێت: تفسیر بریتییە لە زانست و زانیاریەک، کە بەهۆیەوە نامەی خودا کە دابەزێنراوە بۆ موحەممەد (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەزاندرێ، لە ماناکەی حاڵی دەبین و شارەزای حوکمەکانی و حیکمەتەکانی دەبین.[2]

پێناسەی (تأويل) لەڕووی زمانەوانییەوە: وەرگیراوە لە (الأول)وە، واتا (رجوع) گەڕانەوە، لە قاموسدا هاتووە: آل اليه أولاً مآلا: رجع، یان: (ارتد) هەڵگەڕانەوە.

وەکو لە (لسان العرب) هاتووە: الأول: الرجوع، گەڕانەوە، آل الشئ يؤول أولاً ومآلاً: رجع، وآل الشئ: رجعه، گەڕایەوە بۆی، و أولت عن الشئ: ارتددت، هەڵگەڕایەوە.

پێناسەی (تأويل) لەڕووی زاراوەییەوە، دووجۆر پێناسە کراوە:

١ـ پێناسەی (تأويل) لەڕووی زاراوەییەوە: تەفسیر کردنی وتەیەکەو، ئاشکراکردنی واتاکەیەتی، ئیتر چوونیەکە ئەگەر موافەقەی ظاهر بێت، یا پێچەوانەی، لەسەر ئەم پێناسەیە (تأويل .تفسير) موتەڕادیفی یەکترن، هەروەکو موجاهید دەڵێت: إن العلماء

---

١- زرکشی، برهان في علوم القرآن، ج٢، ل١٤٨.

٢- سەرچاوەی پێشوو، ج١، ل١٣.

یعلمون تأویله، واتا: قورئان.

وه ئیبنو جەریری تەبەری لە تەفسیرەکەیدا: القول في تأويل قوله تعالى كذا وكذا. کە مەبەست لێی تەفسیرەکەیەتی.

٢ـ پێناسەی (تأویل) لای شەرعزانان و فەرموودەوانانی ئەهلی تەسەوف: لادانی وتەیەکە لە واتایەکی وەرگیراو بۆ واتایەکی ڕەتکراو، لەبەر هەبوونی بەڵگەیەک لەگەڵیدا.

ئەم پیناسەیە لە گەڵ ئەوەی سەلەفدا جیاوازییەکی زۆری هەیە.

**جیاوازی نێوان تەفسیرو تەئویل:**

١- ئەبو عوبەیدە دەڵێت: تەفسیرو تەئویل یەک واتایان هەیە، هەردووکیان هاومانای یەکن.

٢- ڕاغب ئەسفەهانی: تەفسیر گشتی ترە لە تەئویل، تەفسیر بەزۆری بۆ ئەلفاظ بەکاردەهێنرێت، وە تەئویل بۆ واتا، وەکو تەئویلی خەوبینین.

تەئویل بەزۆری بۆ کتێبی خودا بەکار دەهێنرێت، وە تەفسیر بۆ کتێبی خواو بۆ غەیری ئەویش بەکار دەهێنرێت.

٣- ئەبو تالیبی سەعلەبی دەڵێت: تەفسیر ڕوونکردنەوەو ئاشکراکردنی لەفزێکە کە هاتبێت، حەقیقی بێت یان مەجازی، وەک تەفسیر کردنی (الصراط) بە (الطريق)، وە(الصيب) بە (مطر). تەئویل تەفسیرکردنی ناواخنی لەفزەکەیە.

٤- بەغەوی دەڵێت: تەئویل گێڕانەوەی ئایەتێکە بۆ واتایەک کەهەڵیبگرێت و موافقی پێشی وە پاشی بێت، وە پێچەوانەی قورئان و سوننەت نەبێت لە ڕێگەی ئیستنباتەوە

بێــت، بەڵام تەفســیر قســەکردنە لەســەر هۆکــاری نــازڵبوونی و وە چیــرۆکەکەی، وەگێڕانەوەی.

**پێویستە کەسی موفەسیر(ئەو کەسەی تەفسیری قورئان دەکات) شارەزای ئەم زانستانە بێت:**

١- شــارەزای زمــانی عەرەبــی بێــت: واتــا شــارەزایی هەبێــت لە ووتەی قورئــان، چــۆنێتی بەکارهێنــانی لەنــاو عەرەب، بەمەش دەوترێــت زانســتی (أصــول اللغــة)، وەکــو ئیبنــو عەبــاس ڕەزای خــوای لێبێــت دەفەرمووێــت: واتــای (فــاطر)م نەدەزانــی، تــا گــوێم لە دوو پیاو بوو لە سەر بیرێک هەریەک لەوان دەیووت (أنا فطرتها) واتا: من دروستم کردووە. بـۆیە پێویسـتە کەسـی موفەسـیر شـارەزای لەفـزە هاوبەشـەکان و هـاو واتاکان بێـت، بـۆ ئەوەی بەجوانی لە قورئانی پیرۆز تێبگات.

٢- شارەزای (نەحو و صەرف)بێت: چونکە زۆرێک لە واتای قورئانی پیرۆز لەسەر زانینی ئیعـراب ـ شـیکردنەوە ـ، وەسـتاوە، بـۆیە ئەگەر شـارەزای لەم زانسـتە نەبێـت دەکەوێـتە هەڵەی گەورەوە.

٣- زانستی بەلاغە .ڕەوانبێژی ،. ئەم زانستە وا لە موفەسیر دەکات، کە تەفسیرەکەی تێربکـات، بەهــۆی ئیعجــازی ڕەوانبێــژی و جــوان داڕشــتنی قورئــانی پیــرۆزەوە، ئەمەش لەکاتێکدا دەبێت خۆی شارەزا بکات لە (علوم البلاغة).[١]

٤- شارەزای زانستی (الآثار): واتا شارەزایی لە ووتەکانی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و، ووتەی یاوەران و تابعین هەبێت.[٢]

---

١- الدراسات، ل٤٩٦.

٢- سەرچاوەی پێشوو، ل٤٩٥.

٥- شـــارەزای زانســـتی قیرائـــات: واتـــا ئەو شـــێوازانەی کە قورئـــانی پیـــرۆزی پـــێ دەخوێندرێتەوە، چونکە هەندێک جار تەفسیری قورئان ڕاجیایی تێدەکەوێت، بە هۆی جیـاوازی خوێنـدنەوەکەی. لەگەڵ ئەوەشـدا ئەبێـت ڕەچـاوی ئەوە بکرێـت لە لایەن پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سەلمێنراو بێت.

٦- شارەزای زانستی (أصول الفقه) بێت: چونکە موفەسیر بێگومان ئەو ئایەتانەی دێتە پـێش کە پەیوەنـدیان بە ئەحکـامە شـەرعیەکانەوە هەیە، بـۆیە پێویسـتە ئەو کـاتە بگەڕێتەوە بۆ (أصولی فقه) بۆ ئەوەی هۆکاری حوکمە شەرعیەکان دەربکات.

٧- زانستی عەقیدە: قورئانی پیرۆز بنچینەکەی لە سەر بیروباوەڕێکی تەواو بونیاتنراوە، بۆیە موفەسیر ئەبێت بەشارەزاییەوە ڕۆڵی خۆی ببینێت لە شەرح کردنی عەقیدەکە بە بەڵگەی قورئانی پیرۆز، کە بەڵگەن لەسەر چەسپاندنی بونی خـوداو پێغەمبەران و زینـدووبوونەوەو پاداشـت و سـزاو بەهەشـت و دۆزەخ و ڕوبەڕووبـوونەوەی کەسـانی موشریک و کافر.

٨- زانستی مێژوو: چونکە قورئانی پیرۆز چیرۆکی گەلەکانی پێشووی تێدایە، بۆ ئەوەی خەڵکی پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگرێت.

**ئادابەکانی موفەسیر:**

١- بیروبـاوەڕی ڕاسـت: بیروبـاوەڕی تەواو زۆر گـرنگە بـۆ موفەسـیر، چـونکە ئەگەر خـاوەنی بیروبـاوەڕێکی تەواو نەبێـت ئەوە بەپێی ئەو بیروبـاوەڕە چەوتەو مەزهەبەی کە لەسـەریەتی تەفسـیری دەکـات، نمـوونەی هەنـدێک لەو تەفسـیرانەی کە ئێسـتا لە

بەردەست هەیەو لەلایەن گروپە گومڕاکانەوە نوسراوەتەوە، وەکو: شیعەو خەوارج و موعتەزیلەو.....هتد، کە ڕێگەی پێشینی چاکیان بەرداوە.[1]

٢- نیەت پاکی: دەبێت نیەتی پاك بێت و ئەو تەفسیرەی لەبەر خاتری شتێکی دونیایی نەبێت و تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوای پەروەردگار بێت.[2]

٣- لەخوا ترسان: ئەبێت کەسێکی لە خواترس و بەتەقوا بێت، قورئانی پیرۆز لە ژیانی ڕۆژانەیدا ڕەنگی دابێتەوە.

٤- کار بەقورئانی پیرۆزبکات: یەکێک لە تایبەتمەندیی موفەسیر ئەوەیە خۆی کار بەوە بکات کە لە قورئانی پیرۆزدا هەیەو لەخۆیدا جێبەجێی بکات.

٥- خاوەنی خوڕەوشتی جوان بێت و خۆی بەدوور بگرێت لە هەڵسوکەوت و قسەی نەشیاو، لەگەڵ کەسی نەزان ڕووبەڕوو نەبێتەوە.[3]

## سەرچاوەکانی تەفسیری قورئان بە مأثور

.تەفسیری قورئان بە قورئان.

.تەفسیری قورئان بە قەولی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

.تەفسیری قورئان بە قەولی یاوەران (ڕەزای خوایان لێبێت).

.تەفسیری قورئان بە قەولی تابعین.

---

١- الدراسات، ل٤٩٤.

٢ - هەمان سەرچاوە، ل٤٩٩.

٣- الدراسات، ل٥٠١.

**تەفسیری قورئان بە قورئان:**چونکە قورئانی پیرۆز ئەگەر ئایەتێکی هەندێکجار بە موجمەلی هێنابێت لە جێگەیەکەی تردا بەتەفسیلی هێناویەتیەوە، ڕوونکەرەوەی ئایەتەکەی ترە، یان هەندێکجار بە رەهایی یان تایبەت هێناویەتی و لەجێگەیەکی تر بە سنوردار و گشتگیر هیناویەتیەوە، ئەم شێوەیە پێی دەوترێت: تەفسیری قورئان بە قورئان، باشترین تەفسیر تەفسیری قورئانە بە قورئان، نمونەش زۆرە لە قورئانی پیرۆز، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿ أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ٦٢ ﴾ یونس: ٦٢، خوای پەروەردگار بەم شێوەیە تەفسیری [أولیآء الله] کردووە لە ئایەتێکی تردا: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ٦٣ ﴾ یونس: ٦٣

نمونەیەکی تر لەوانە خوای پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلطَّارِقُ ٢ ﴾ الطارق: ٢

• لە ئایەتی دواتر خوای پەروەردگار ووشەی: (الطارق)ی تەفسیر کردووە بە: [النَجمُ الثَاقِبُ]

وە لەم نموونانە زۆرن لە قورئانی پیرۆز.

**تەفسیری قورئانی پیرۆز بە ووتەی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ):**

لەبەر ئەوەی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) گەیەنەری ئەوەیەوە کە خوای پەروەردگار ناردوویەتی، زاناترینی خەڵکەکەیە، هاوەڵان ئەگەر لە ئایەتێک تێنەگەشتبان دەڕۆیشتنە خزمەتی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بۆ ئەوەی شی بکاتەوە بۆیان و واتای ڕاست و مەبەستەکەی بۆیان ڕوونبکاتەوەوە.

له ئیبنو مەسعودەوە ڕەزای خوای لێبیت ڕیوایەت کراوە دەڵێت: کە ئایەتی: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ ﴾ الأنعام: ٨٢ دابەزی، هاوەڵان بەلایانەوە قورس بوو، چوونە خزمەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! کێمان هەیە ستەم لە خۆی نەکات و تووشی تاوانکردن نەبێت. پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێی فەرموون: ووشەی (ظلم) لەو ئایەتەدا ئەو واتایە ناگەیەنێت کە ئێوە لێی تێگەیشتون، ووشەی (ظلم) لە ئایەتەکەدا بە واتای هاوەڵدانانە بۆ خودا، ئەی ئەوەنییە بەندەی ڕاستگۆی خودا (لوقمان) کە ئامۆژگاری کوڕەکەی کرد وتی: ﴿ إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ ١٣ ﴾ لقمان: ١٣[١]

**تەفسیری قورئان بە ووتەی هاوەڵان ڕەزای خوایان لێبێت:**

هاوەڵانی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خاوەنی زانست و زانیاریەکی باش بوون دەربارەی قورئانی پیرۆز، چونکە قورئانی پیرۆز بە زمانی ئەوان دابەزی و لە سەردەمی ئەوان بوو، هاوەڵان لە دوای پێغەمبەران ڕاستگۆترینی خەڵکی بوون لە وەرگرتنی حەق و دینەکە و، خۆیان لە هەموو هەواو ئارەزوو و ڕەفتارێکی ناشەرعی پاراستووە.

هاوەڵان لە ڕوانگەی تێگەیشتنی خۆیانەوە تەفسیری قورئانی پیرۆزیان کردووە، کەسی شارەزایان تێدابووە لە تەفسیرکردنی قورئانی پیرۆز، وەکو: هەر چوار خولەفای ڕاشیدین و ئیبنو عەباس و ئیبن مەسعودو ئوبەی کوڕی کەعب و ئەبو موسای ئەشعەری و زەیدی کوڕی سابیت...، زیاتر ئەم هاوەڵە بەڕێزانە شارەزایەکی چاکیان هەبوو لە تەفسیرکردنی قورئانی پیرۆز.

---

١- بوخاری/ ٦٩١٨.

نمــوونەیەک لەوانە، خــوای پەروەردگــار دەفەرمووێــت: ﴿ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَـٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ ﴾ النســـاء: ٤٣، ئیبنـو عەبـاس ڕەزای خــوای لێبێــت: (لامَسْــتُمُ) تەفســیری کــردووەو فەرمــوویەتی: واتــای جیمــاعە ـ سەرجێییکردن ـ

**تەفسیری قورئان بە ووتەی تابعین:**

ئەگەر تەفیسری قورئان نەبوو، نە لە قورئانی پیرۆز، نە لە سوننەتی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ)، نە لە ووتەی یـاوەران، ئەوە خەڵکی دەگەڕێنەوە بـۆ ووتەی تـابعین، وەکو موجاهید، ئیبن جوبەیر...، چونکە کۆمەڵێک لە تابعین لە خزمەتی هاوەڵان بوون بـۆ وەرگرتنی زانستی شـەرعی و تەفسـیری قورئـانی پیرۆز، ئیبنـو صـالح لە موجاهیـدەوە دەگێڕێتەوە دەڵێـت: سێ جـار لە خزمەتـی ئیبنـو عەبـاس دەوری قورئـانم کـردەوە، لە سـەرەتاوە تـا کۆتـایی، وە لە سـەر هەمـوو ئایەتێـک دەوەسـتام و پرسـیارم لێ دەکـرد، سـوفیانی سـەوری دەڵێـت: ئەگەر تەفسـیرێک لە لایەن موجاهیـدەوە بـۆت هـات ئەوە بەستە.

هەنـدێکی تـر لەوانەی کە شـارەزای تەفسـیر بـوون، وەکـو: عیکـڕەمە، عەتـائی کـوڕی ڕەبـاح، حەسـەنی بەصـری، مەسـروقی کـوڕی ئەجـدەع، سـەعید کـوڕی موسـەیەب، قەتادە، زوحاکی کوڕی موزاحم...، ئەم زانانە بەڕێزانە لە خزمەتی هاوەڵان شارەزایەکی باشـیان وەرگـرت لە وەگرتنی زانسـتی شـەرعی و تەفسـیری قـوڕئـانی پیـرۆز، هەروەهـا ئەمانیش کۆمەڵێ زانای تریان بۆ دوای خۆیان پێگەیاند.

## تەفسیر بە مەئثورو تەفسیر بە ڕەئی

## (التفسير بالمأثور والتفسير بالرأي)

تەفسیر بە مەئثور: بریتییە لە تەفسیرکردنی قورئانی پیرۆز بەقورئان و فەرموودەی سەحیح، یان قەولی هاوەڵان، یان تابعین.

بە سونەتی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)و، ووتەی هاوەڵان و ووتەی تابعین دەوترێت: (مأثور).

لە پێشدا باسمان کردو نموونەمان بۆ هەر یەکەیان هێنایەوە.

ڕاجیایی دەربارەی تەفسیری بە مەئثور:

ڕاجیایی دەربارەی تەفسیری بە مەئثور دەبێتە سێ بەشەوە:

١- ڕاجیایان هەیە لە لەفزەکەی، لەسەر واتاکەی هاوڕان، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿ ۞ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ﴾ الإسراء: ٢٣، ئیبنو عەباس دەڵێت: قَضَى: واتا فەرمانی پێکردون، موجاهید دەڵێت: واتا ئامۆژگاری کردون، ڕەبیعی کوڕی ئەنەس دەڵێت: واتا واجبە لەسەرتان.

ئەم جۆرە تەفسیرانە واتاکانی یەکە، یان واتەکەی لە یەکترەوە نزیکە، کاریگەری لەسەر واتای ئایەتەکە دروست ناکات.

٢- ڕاجیاییان هەیە لەسەر لەفزو واتاکەی، لە هەمان کاتدا هەردوو واتاکەش هەڵدەگرێت و دژیەک نین، ئایەتەکە لەسەر هەردووکی تەفسیردەکرێت، دەتوانرێت کۆبکرێتەوە، وە بە نموونە بهێنرێتەوە، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿ وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ٱلَّذِىٓ ءَاتَيْنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ ٱلشَّيْطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ﴿١٧٥﴾

وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخْلَدَ إِلَى ٱلْأَرْضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ ﴾ الأعراف: ١٧٥ - ١٧٦

ئیبنو مەسعود دەڵێت: ئەو پیاوە لە بەنو ئیسرائیل بووە، ئیبنو عەباس دەڵێت: ئەو پیاوە لە ئەهلی یەمەن بووە، وەدەشوترێت: ئەو پیاوە ئەهلی بەلقاْ بووە.

ئەتوانرێت ئەم ووتانە کۆبکرێتەوەو نابنە دژی یەکتر، ئەکرێت هەریەک لەو ووتانە بە نموونە بهێنرێتەوە.

٣- ڕاجیایـیان هەیە لەسـەر لەفـزو واتـاکەی، لە هەمـان کاتـدا هەردوو واتـاکەش دژیەکن، لەم حاڵەتە دەبێت ڕاستترینیان وەربگیرێت، بەهۆی ئایەتی تر یان دەلیلی شەرعی یەکلابکرێتەوە.

وەکو ئەم نموونەیە خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ إِلَّآ أَن يَعْفُونَ أَوْ يَعْفُوَا۟ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ عُقْدَةُ ٱلنِّكَاحِ ﴾ البقرة: ٢٣٧، ئیمامی عەلی دەفەرمووێت: الَّذِي بِيَدِهِ عُقْدَةُ النِّكَاحِ: مارەییەکە بەدەسی پیاوەکەیە،

ئیبنو عەباس دەفەرمووێت: الَّذِي بِيَدِهِ عُقْدَةُ النِّكَاحِ: مارەیـیەکەی بەدەستی وەلی ئەمرەکەیەتی.

بەڵام بۆچونی یەکەم (بۆچوونی ئیمامی عەلی) تەواوە، چونکە فەرموودەی لەسەر هاتووە.

تەفسیر بە ڕەئی، (التفسير بالرأي):

**دوو جۆر تەفسیر بەڕەئی هەیە:**

١- ستایشکراو: ئەو تەفسیرەیە کەپشت بەقورئان و سوننەتی پێغەمبەری خوا(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەبەستێت و، خاوەنەکەی زانایە بەزمانی عەرەبی و شێوازەکانی و، بنچینەکانی شەریعەت و بنەماکانی.[1]

٢- لۆمەکراو: ئەو تەفسیرەیە کەتەنها ڕاو بۆچوون و هەواو ئارەزووی خۆیەتی. زۆرینەی ئەوانەی کەتەفسیری قورئان بەم جۆرە دەکەن، ئەوانەن کە بیدعەچی و خاوەنی بیروبۆچوونێکی پوچەڵن و بەڵگەیەکی دروستیان نیە، ئایەتەکانی قورئان بەو شێوازە تەفسیر دەکەن کەلەگەڵ بیروبۆچوون و مەزهەبیان گونجاوەو بەو شێوازە لێکدانەوەی بۆ دەکات.[2]

گومان لەوەدا نییە، کە عەقڵ گرنگترین شتە کە ئینسان لە دروستکراوەکانی تر جیادەکاتەوە، قورئانی پیرۆز داوای بیرکردنەوەو تێفکرین دەکات، گرنگترینی کاری عەقڵ ئەوەیە بیر بکاتەوە لە ئایەتەکانی خوای پەروەردگارو پەندی لێوەربگرێت.

وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ النحل: ٤٤

بەوشێوەیە خوای پەروەردگار ڕوو لە عەقڵ دەکات بۆ ئەوەی تێبفکرێت، لەم ڕووەوە عەقڵ هۆکارە بۆ تێگەیشتن لە کیتابەکەی خوای پەروەردگار، ئەمەش ڕوویەک

---

١- الدراسات، ل٤٧٠.

٢- الدراسات، ل٤٧٢.

وەردەگرێت لە ڕووەکانی تەفسیر، کە پێی دەوترێت تەفسیری عەقڵی یان تەفسیری بە ڕەئی.

واتای تەفسیر بە ڕەئی: لە دەرئەنجامی بیرکردنەوەو تێفکرین دەگاتە تەفسیرکردنی قورئانی پیرۆز، ئەگەر بەشێوەیەکی جوان لە سەر بنەماکان و قەواعیدی تەفسیر بوو، ئەوە رەئیێکی جوان و پەسەندە، ئەگەر بەوشێوەیەش نەبوو ئەوە ناپەسەندو لۆمەکراوە.

**هەڵوێستی زانایان لەسەر تەفسیری بەڕەئی:**

هەڵوێستی زانایان لە سەر تەفسیری بە ڕەئی دابەش دەبن بۆ دوو گرووپ، گروپێکیان بە توندی دژایەتی و ڕێگری لێ دەکات، ئەگەر لە سەر بنەماکانی تەفسیریش بڕوات، وەگرووپی دووەم بە پێچەوانەی ڕای یەکەم، دەڵێن: ئەگەر لەسەر بنەمای ئەدەب و زانستەوە بێت دەکرێت تەفسیری قورئان بکات بە بۆچوون و ئیجتیهادی خۆی، هەر یەک لەمانەش دەلیل و بەڵگەیان پێیە بۆ قسەکانیان:

**دەلیلی ئەوانەی کەدەڵێن نابێت:**

١- تەفسیری بە ڕەئی قسەکردنە لەسەر خوای پەروەردگار بە بێ زانیاری، وە قسەکردن لەسەر خوای پەروەردگار بە بێ زانیاری نەهی لێکراو و قەدەغەیە، وەکو خوای پەروەدگار دەفەرمووێت: ﴿ قُلۡ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلۡفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنۡهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلۡإِثۡمَ وَٱلۡبَغۡيَ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَأَن تُشۡرِكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ سُلۡطَٰنٗا وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٣٣ ﴾ الأعراف: ٣٣

• واتـا: بلّـێ پەروەردگاری مـن حەرامی کـردووە..... ،کە قسـە لەسـەر خـوای پەروەردگار بکەن بەبێ زانیاری.

٢- فەرموودەی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەسەر قسەکردن لە قورئانی پیرۆز بە ڕەئی وەکو: لە ئیبنو عەباسەوە ڕیوایەت کراوە ڕەزای خوای لێبێت، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرمووێت: (فمن كذب على متعمداً فليتبوأ مقعده من النار،ومن قال في القـران برأيـة فليتبـوأ مقعـده مـن النـار)، واتـا: هەرکەس درۆیەک بە ئەنقەسـت بەدەمی منەوە ببەسـتێت، بـا جێگەیەک لە دۆزەخ بۆخـۆی دیـاری بکـات، هەرکەسـێک شـتێک بلێـت لە سـەر قورئـانی پیرۆز بە ڕەئـی خـۆی، بـا جـێگەیەک لە دۆزەخ بۆخـۆی دیاری بکات.[1]

٣- هەندێک لە وتەی هاوەڵان و تابعین ڕەزای خوایان لێبێت بە بەڵگە دەهێننەوە وەکو، ئەبـو بەکـری سـدیق ڕەزای خـوای لێبێـت دەفەرمووێـت: (ئەگەر لە گەردنـم بـدرێت، قسـەیەک بە ڕەئی خـۆم نـاکەم لە سـەر قورئـان)، ئەگەر لە سـەعیدی کوڕی موسـەیب پرسـیای حەڵاڵ و حەڕام بکـرایە، وەڵامی دەدانەوە، بەڵام ئەگەر تەفسـیری ئایەتیـان لێ بپرسیایە بێدەنگ دەبوو.

**دەلیلی ئەوانەی دەڵێن دروستە:**

١- ئەم ئایەتـانە بە دەلیـل دەهێنـنەوە: وەکـو خـوای پەروەردگار دەفەرمووێـت: ﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَٰتِهِۦ ﴾ ص: ٢٩، لەئـایەتێکی تـردا خـوای پەروەدگـار دەفەرمووێـت: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ۝٢٤ ﴾ محمـد: ٢٤، ئەم

---

١- ترمذی ڕیوایەتی کردووەو دەڵێ(حەسەنە)، بەڵام شێخی ئەلبانی بەزەعیفی داناوە.

ئایەتانە هەمووی هانی ئینسان دەدات بۆ ئەوەی تێبفکرێت، ئەمەش بەکرداری عەقڵ دەکرێت، بۆ ئەوەی پەندوئامۆژگاری لێوە وەربگرێت، ئەمەش ئینسان دەگەیەنێتە خواپەرستی، ئیتر چۆن دەبێت ڕێگری لە شتێک بکرێت کە ئینسان بەهۆی ئەوەوە دەگاتە خواپەرستی؟!.

٢- ئەگەر دەڵێن تەفسیر بە ڕەئی دروست نیە، دەبێت ئیجتیهادیش لە ئەحکامە شەرعیەکان دروست نەبێت، دەی کەوابێت ئاشکرایە بۆچوونێکی دروست نیە.

٣- دەلیلێکی تر لەوانە، ئەو هەموو هاوەڵانەی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەندێکجار بۆچوونیان جیاواز بووە لەسەر ئایەتێک هاوڕا نەبوون، ئەگەر تەفسیر بەڕەئی حەرام بێت ئەوا ئەوەی هاوەڵانیش ڕەزای خوایان لێبێت پەنا بەخودا حەڕام بووە.

**بۆچوونی پەسەند ئەوەیە کە تەفسیر بەڕەئی دروستە، بەڵام بەم مەرجانە:**

١- ئەبێت پابەند بێت بە لەفزەکانەوە، بەکار هاتبێت لە زمانەوانی عەرەبدا، لە سیاقی شەرعی دەرنەچێت.

٢- ئەبێت هەواو ئارەزوی خۆی تێکەڵ نەکات.

٣- نابێت بەپێی بیروبۆچوونی مەزهەبێکی گوومڕا بێت و، خۆشی شوێن کەوتەی ئەو بێت، چونکە ئەو کاتە بۆ بەهێزکردنی بیروبۆچوونی مەزهەبەکەی دەیکات و دوور دەبێت لە حەق و ڕاستی.

٤- نابێت تەفسیرێکی وابێت دووربێت لە حەق و ڕاستیەوە و، بەدەر بێت لە بازنەی بیرکردەنەوەی ئینسان.

**نموونەی چەند کتێبێک لەو تەفسیرانەی کە بەڕەئی نوسراون:**

١- مفاتيح الغيب: فخرالدين الرازي/ ٦٠٦.

٢- أنوار التنزيل وأسرار التأويل: البيضاوي/ ٦٨٥.

٣- مدارك التنزيل وحقائق التأويل: النسفي/ ٧٠١.

٤- لُبابُ التأويل في معاني التنزيل: لعلي بن محمد بن ابراهيم بن عمر، ناسراوة بة (خازن)/ ٧٤١.

٥- البحر الميط: لأبي حيان الأندلوسي/٧٤٥.

٦- إرشاد العقل السليم إلى مزايا الكتاب الكريم: لأبي السعود/ ٩٨٢.

٧- غرائب القرآن ورغائب الفرقان: لنظام الدين ابن الحسن بن محمد النيسابوري/ ٨٥٠.

٨- تفسير الجلالين: لجلال الدين المحلى/ ٨٦٤ نسبة الى المحلة من أقاليم مصر، وجلال الدين السيوطي/ ٩١١، نسبة الى أسيوط.

**گرنگترین تەفسیری نوسراو بەشێوەی تەفسیری بە مەئثور:**

١- ئەو تەفسیرەی پاڵدراوە بۆ لای ئیبن عەباس.

٢- تەفسیری ئیبن عویەینە.

٣-تەفسیری ئەبی حاتەم.

٤-تەفسیری ئەبی الشیخ ئیبنو حەبان.

٥- تەفسیری ئیبنو عەطیە.

٦- تەفسیری ئەبی اللیث السمرقندی(البحر العلوم).

٧- تەفسیری ئەبی ئیسحاق (الكشف والبيان عن تفسير القرآن).

٨- تەفسیری ئیبن و جەریری تەبەری (جامع البیان فی تفسیر القرآن).

٩- تەفسیری ئبنو ئەبی شەیبە.

١٠- تەفسیری البغوی (المعالم التنزیل).

١١- تەفسیری ئیبنو کەسیر (تفسیر القران العظیم).

١٢- تەفسیری سەعلەبی (الجواهیر الحسان في التفسیر القرآن).

١٣- تەفسیری شەوکانی (فتح القدیر).

**١- تەفسیری ئیبنو عەباس:**

ئەم تەفسیرە دراوەتە پاڵ ئیبنو عەباس، بەناوی (تنویر المقیاس من تفسیر ابن عباس)، لە میسر چەندجارێک چاپکراوە، ئەبو تاهر، محمد بن یەعقوب فیروز ئابادی شافعی، خاوەنی کتێبی قاموسی(المحیط)کۆی کردووەتەوە.

ئیبنو عەباس بەوە مەشهور بوو کە: تەرجومانی قورئانە، عومەری کوڕی خەتاب متمانەی بە تەفسیری ئیبنو عەباس هەبووەو زۆر ڕێزی لێگرتووە، ئیبن عەباس لە هەندێ شوێندا شتی لە ئەهلی کتاب وەرگرتووە، بەڵام بە مەرجێک دژی قورئان نەبووبێت، واتا: لەشتێکدا قورئان و تەوڕات و ئینجیل دژایەتیان لەگەڵ یەک نەبووبێت، زانیاری لێ وەرگرتوون بەڵام زۆر بەکەمی و سنوردار.

زۆرجار بەو هۆیەوە تووشی ڕەخنە بووتەوە، بەڵام وەڵامی ئەو ڕەخنانە دراوەتەوە، چونکە ئیبنو عەباس لە شتێکدا کە پەیوەندی بە بیروباوەڕەوە بووبێت پرسیاری لێ نەکردوون، تەنها ئەوەندەنەبێت کە پەیوەندی بە چیرۆک و هەواڵەوە بووە، وەریگرتووە ئەوەش زۆر بەکەمی.

## ٢- جامع البيان في تفسير القرآن للطبري:

ئەم تەفسیرە ناسراوە بە (تەفسیری تەبەری)، کە هی زانای بەناوبانگی ئیسلامیە بەناوی: محمدی کوڕی جەریری کوڕی یەزید کوڕی کەسیری کوڕی غالبە، کە ناسراوە بە پێشەوا (ئەبو جعفەری ئەلتەبەری)، لەدایک بووی ساڵی (٢٢٤-٣١٠کۆچی)[١] ئەم تەفسیرە لە بەناوبانگترین تەفسیرەکانی ئەهلی سونەیە، لەم تەفسیرەدا لە تەفسیری هەر ئایەتێکدا قەولی هاوەڵان و تابعینی هێناوەتەوە، گرنگی بە قیرائاتە جیاوازەکان داوە و، لە هەرئایەتێکدا تەرجیحی بە یەکێکیانی داوە.

لە تەفسیری ئایەتەکان فەرموودەی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)ی هێناوەتەوە و، باسی ئەحکامە فیقهیەکانی و ، چیرۆکە ئیسرائیلیاتەکانی کردووە.

تەفسیری ئیبنو جەریر لە (٣٠)بەرگدا خۆی دەبینێتەوە، بۆ یەکەم جار لە ساڵی (١٣٢١کۆچی) لە مێر چاپکرا، وە (محمد بن صماد التجيبي الأندلسي کە لەساڵی (٤١٩ کۆچی)، کۆچی دوای کردووە پوختەی کردووە بە ناوی (إختصار غريب القرآن)، وە لە ساڵی (١٣٩٠ کۆچی) چاپ کراوە.

تەفسیری تەبەری تەفسیرێکی نایاب و بەنرخە، وە شێخی سیوطی دەفەرمووێت: پێشەوا ئەبو جەعفەر پێشەنگی موفەسیرینە، هاوشانی نییە، شارەزای هەموو زانستەکان بووە لە زەمەنی خۆیدا هاوشێوەی نەبووە، قورئانی لەبەربووەو شارەزای واتاکەی بووە، زانا بووە بە ئەحکامەکانی قورئان، زانا بووە بە فەرموودەکانی .پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ .بە ڕێگاکانی لە ڕووی سەحیح و لاوازیەوە و، بە ناسخ و مەنسوخ و، بە ژیانی هاوەڵان و تابعین.

---

١- الداودي، طبقات المفسرين، ج٢، ل١١٤.

دەربارەی تەفسیرەکەی دەفەرمووێت: تەفسیرەکەی بەنرخترین و گەورەترین تەفسیرە، کتێبخانەیەکە بۆ خۆی، بۆچوونی ئەم و ئەو دێنێت و تەرجیحی هەندێکیان دەدات بەسەر ئەویتریان، هەندێکجار دەست بۆ ئیعراب و دەرهێنانی حوکمی شەرعی و ئوسوڵی دەبات، کەوابێ تەفسیرەکەی باڵا دەستە بەسەر تەفسیری زانایانی پێشیندا و هیچیان ناگەنە ئاستی ئەو.

ئبنو خوزەیمە دەفەرمووێت: هیچ کەسێک زاناتر نیە لە سەر زەوی زاناتربێت لە محمدی کوڕی جریر.

ئیمامی نەوەوی دەفەرمووێت: ئومەتی ئیسلامی کۆڕایان هەیە لە سەر ئەوەی تا ئیستا تەفسیری تەبەری شاکارەو نمونەی نیە.[1]

ئەو ئادابانەی تەبەری لە تەفسیرەکەی پەیڕەوی کردووە، ئەوە بووە ئیعتمادی کردۆتە سەر فەرموودەی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)و، قەولی هاوەڵان و تابعین لە تەفسیری ئایەتەکان واتاکەی، زۆر نکۆڵی لەوە کردووە کە تەنها ڕەئی بەسبێت بۆ تەفسیری قورئان، بە دروستی نەزانیوە کەسێك بە ڕەئی و بۆچوونی خۆی تەفسیری قورئان بکات، بێ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ فەرموودەی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) یان قەولی هاوەڵان یان دەلیلێک، چونکە مەرج نیە بەڕەئی خۆی بیپێکێ، ئەو کات یەقینی تێدا نایەتە جێ، کەوابوو ناکرێت بەگومان تەفسیری قورئان بکرێت ئەگەر زانیاری تەواوت لە سەری نەبێت.

---

١- الإتقان للسيوطي: ج٢/١٩٠.

لە تەفسیرەکەیدا فەرموودەو قەولی هاوەڵانی تێدا هێناوەتەوە، کە سەحیح و لاوازی تێدایە، کە شێخی سیوتی لە کتێبی (الإتقان في علوم القرآن) دا هێناویەتەوە ئاماژەی پێکردووە.

هەروەها لە تەفسیری ئایەتەکان ئیعتیباری کردۆتە سەر ئیجماع و کۆڕای زانایان، ئیبنو جەریر گرنگی بەبواری قیرائات دەدات، ئەوانەی ڕەتکردووەتەوە کە ئیجماعی لەسەر نەبووە، ئەوانەی وەرگرتووە کە سابیت و چەسپاو بوون، هەندێکجار بێ ئەوەی تەرجیح بە هیچکامیان بدات وەستاوە لە سەریان.

لە تەفسیرەکەیدا گرنگی بە ئەحکامە فیقهیەکان داوە، چونکە ئیبنو جەریر خۆیشی خاوەنی مەزهەبێک بووە، ئایەتە فیقهیەکانی دەستنیشان کردووەو موناقەشەی کردووە، پاشان ئەحکامە فیقهیەکانی تێدا دەرکرووە و، دەلیلە بەهێزەکانی تێدا دەستنیشان کردووە.

هەروەها باسەکانی عەقیدەو بیروباوەڕی تێدا خستۆتەڕوو، ڕەددی ئەو بیروبۆچوونانەشی داوەتەوە کە پێچەوانەی ئەهلی سونەت و جەماعەت بوون.

### ٣- المحرر الوجيز في تفسير الكتاب العزيز:

ئیبنو عەتیە کەناوی تەواوی ئەبو محمد عەبدولحەقی کوڕی ئەبی بەکری غالبی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی غالبی کوڕی عبدولڕەئوفی کوڕی تەمامی کوڕی عبدوللە ی کوڕی تەمامی کوڕی عەتیەیە، لە ئەندەلوس لە شاری غەرناتە لەدایک بووە، لەنێوان ساڵانی (٤٨١-٥٤١ کۆچی) ژیاوە، یەکێک بووە لە شەرعزانە گەورەکانی ڕۆژگاری خۆی، زاناو شارەزا بووە لە تەفسیرو ئەحکامی فەرموودەو لوغەو ئەدەب.

کتێبەکەی لە بـواری تەفسـیردا نـاوی: (المحـرر الـوجیز في تفسـیر الكتـاب العزیـز لإبـن عطیـة)، ئیبنـو عەتیە لە تەفسـیرەکەیدا گەڕاوەتەوە بـۆ فەرمـوودەی پێغەمبەرو قەولی هاوەڵان و تابعین، هەروەها قەولی موفەسیرینیشی نەقڵ کردووە، قەولی ئیبنـو جەریری نەقڵکـردووە، هەنـدێکجاریش ڕەددی لێ داونەتەوە، لە تەفسـیرەکەیدا زۆر گرنگـی بە ئەدەب و لوغەی عەرەبی قەواعیدی نەحوی داوە.

ئیبنـو تەیمـیە موقـارەنەی لەنێـوان تەفسـیری ئیبنـو عەتـیەو تەفسـیری زەمەخشـەری دەکـات دەفەرمووێـت: تەفسـیری ئیبنـو عەتـیە لە تەفسـیری زەمەخشـەری باشـترو بەسـودترە، سـەحیحترە لەڕووی ڕیوایـات و لێکـۆڵینەوەوە، دوورتـرە لە بیـدعەت، هەرچەنـدە ئەمیش هەنـدێ لە بیـدعەتی لە خۆگرتـووە، بەڵکو تەفسـیری ئیبنـو عەتـیە زۆر لە تەفسیری زەمەخشەری باشترە.[(١)]

**٤- تەفسیری ئیبنو کەسیر:**

نـاوی عیمـادەدین ئەبولفیـدا ئیسـماعیلە، لە دیمەشـق لەنێـوان سـاڵانی (٧٠١-٧٧٤ کـۆچی) ژیـاوە، مـوحەدیس و موفەسـیرو فەقیـە بـووە، لە بەناوبـانگترین کتێبەکـانی: (تفسیر القران العظیم، البدایة والنهایة)، لەخزمەتی هەندێ زانای بەناوبانگ بووە و، زانستی وەرگرتووە لە شێخ ئیبراهیم فەزازی و، ئەحمەد کوڕی ئەبی تالب و قاسم کوڕی عەساکر و، ئیبنو شیرازی و ئیسحاقی کوڕی ئامدی و شێخ جەمال یوسف کوڕی زەکی المزی کەخاوەنی کتێبی (التهذیب الكمال)ە و، ئیبنو تیمیە....

ئیبنـو کەسیر لە تەفسیرەکەیدا (تفسـیر القرآن العظیم)، دەگەڕێتەوە بـۆ فەرمـوودەی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) وە قەولی هـاوەڵان و تـابعین، زۆر گرنگی بە لـوغەی

---

١- مجموع فتاوی لإبن تیمیة: ١٣/٣٨٨.

عەرەبی و زانستەکەی داوە، بەسەنەدی فەرموودەکان و قیرائاتە جیاوازەکان و هۆکاری هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان.

ئیبنو کەسیر لە تەفسیرەکەیدا بە دەستەواژەیەکی ئاسان و کورت واتای ئایەتەکانی بەشێوەیەکی گشتی ڕوونکردۆتەوە، تەفسیری ئایەتی بە ئایەتی تر کردووە، ئەگەر هەبوو بێ بۆ ئەوەی واتاکەی ڕوونبکاتەوە، ئەگەر ئایەت نەبووبێ بە فەرمودەی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تەفسیری کردووە، زۆر کاتیش سەنەدەکانی باس کردوە و، قەولی هاوەڵان و تابعینی هێناوەتەوە، بە تایبەتی چینی سەدەی یەکەم، ئیسرائیلیاتی هێناوەتەوە، هەندێکجار ووتویەتی ئەمە درۆو هەڵبەستراوە.

هەروەها ئەحکامە فیقهیەکانی ڕوون کردۆتەوە، ئەو ئایەتانەی کە پەیوەندی بە ئەحکامە فیقهیەکانەوە بووە. ئیبنو کەسیر ئیعتیمادی کردۆتە سەر لوغەی عەرەبی، وە شیعر بۆ تێگەیشتن لە قورئانی پیرۆز.

ئیبنو کەسیر ئیعتیمادی کردۆتە سەر موفەسیرانی پێش خۆی، نەقڵی لێیانەوە کردووە، لەوانە ئیبنو جەریری تەبەری و ئیبنو ئەبی حاتەم و ئیبنو عەتیە و قەولی ئیبنو تەیمیە.

***بەناوبانگترین کتێبەکانی تەفسیر بە ڕەئی:**

١- تفسير عبدالرحمن بن كيسان الأصم.

٢- تفسير أبى على الجبائي.

٣- تفسير قاضى عبدالجبار.

٤- تفسير الزمخشري (الكشاف عن حقائق غوامض التنزيل، وعيون الأقاويل في وجوه التأويل).

٥- تفسير فخرالدين الرازى (مفاتيح الغيب).

٦- تفسير ابن فورك.

٧- تفسير النسفي (مدارك التنزيل و حقائق التأويل).

٨-تةفسير الخازن (الباب تأويل في معاني التنزيل).

٩- تفسير البيضاوي (أنوار التنزيل و أسرار التأويل).

١٠- تفسير ابي حيان (البحر المحيط).

١١- تفسير الجلالين:جلال الدين المحلى و جلال الدين السيوطي.

١٢- تفسير القرطبي (الجامع الأحكام القرآن).

١٣- تفسير أبي السعود (إرشاد العقل السليم إلى مزايا الكتاب الكريم).

١٤- تفسير الآلوسى (روح المعاني).

### ١- مفاتح الغيب للرازي:

فەخرەدین ناوی ئەبو عبداللە محمد کوڕی عومەری کوڕی حەسەنی کوڕی حوسێنی کوڕی رازیە، لەنێوان سالآنی (٥٤٤-٦٠٥کۆچی) ژیاوە، قورەیشیە لە تەبرستان لە دایک بووەو شافعی مەزهەبە، پێشەوای موفەسیرینە فەقیهـ و ئوسولی بووە، زاناش بووە لە بوارەکانی فیزیاو بیرکاری و پزیشکی، یەکێ بووە لە سەرخەرانی مەزهەبی ئەهلی سونەت بە تایبەتی مەزهەبی ئەشاعیرە، ڕەددی فەلاسیفەو موعتەزیلەی داوەتەوە.

خاوەنی کتێبی (مفاتيح الغيب، المحصول في علم الأصول، تأسيس التقديس، نهاية الإيجاز في دراية الإعجاز).

فەخرەدینی ڕازی تەفسیرەکەی تەفسیری بە ڕەئی یە، لە (٨) بەرگ پێکهاتووە، بەلآم خۆی هەموو تەفسیرەکەی تەواو نەکردووە، ئیبنو حەجەر لە کتێبی (الدرر الكامنة في

أعيـان المائـة الثامنـة) دەڵێـت: ئەو کەسـەی تەفسـیرەکەی فەخرەدینی رازی تەواو کـردووە، ئەحـمەدی کـوڕی محمدی کـوڕی ئەبیـل حەزمی مەککی نەجمەدینی مەخزومی قەمولی بـووە، لەسـاڵی (٧٢٧کۆچی) کۆچی دوایی کـردووە، کەخـاوەنی کتێبی (الکشـف الظنون).

فەخرەدینی ڕازی گرنگی بە مەناسەباتی نێوان ئایەتەکان داوە، لە تەفسیرەکەیدا گرنگی بە زانسـتی بیرکـاری و فەلسـەفە داوە، ڕەددی هەنـدێک لە بیروبۆچـوونی فەلاسـیفەی داوەتە.

هەروەهـا لەسـەر ئایەتەکـان وەسـتاوەو حـوکمەکەی ڕوونکـردۆتەوە، بیروبۆچـوونی فوقەهـای هێنـاوەتەوە تێیـدا، دوای ئەوە تەرجیحی بە مەزهەبی شـافعی داوەو بەڵـگەی بۆ هێناوەتەوە.

فەخرەدینی ڕازی دوورکەوتـۆتەوە لە ڕیوایـاتی ئیسـرائیلیات، مەگەر ئەوە نەبێـت کە دەقێکی صەریحی لە بارەوە هاتبێت، باوەڕ پێکراو بێت بە پێی قورئان و سوننەت بێت.

هەندێک لەزانایان ڕەخنەی توندیان لێگرتووە، وەکو ئیبنو تەیمیە بەهۆی ئەوەی زۆر خەریکی عیلمی کەلام بـووە، وە ئەو مەزهەبەی لە سـەری بـووە کە ئەشـعەری مەزهەب بـوو، بەڵام ئیبنـو صلاح دەیگێڕێتەوە دەڵێت: فەخرەدینی ڕازی دەیوت: خۆزگایە تـوخنی علمی کەلام نەبوومایەتەوە، پاشان دەستی دەکرد بەگریان.[1]

---

١- شذرات الذهب: (٧/٤١).

وه ئیبنـولقەیم دەڵێـت: گەڕاوەتەوە بـۆ ڕێـگەی وەحی و سـوننەتی پێغەمـبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).[1]

## ٢- البحر المحيط لأبي حيان:

ناوی محمدی کوڕی یوسـف کوڕی علی کوڕی یوسـفی کوڕی حەیانە، کە ناسراوە بە ئەبو حەیـان ئەندەلۆسـی یـان غەرنـاتی، لە سـاڵی (٦٥٤-٧٤٥کـۆچی) ژیـاوە، ئەم زانـا بەڕێـزە ئەشعەری بووە، (ظاهری) مەزهەب بووە، شـارەزاییەکی باشی هەبووە لە زمانی عەرەبی و زانسـتی تەفسـیر، لە ئەندەلوسـەوە دێـتە میصـر، لە میصـر کـۆمەڵە زانـایەک پێدەگەیەنێت لەوانە (تقي الـدين السبكي، تـاج الـدين السبكي، جمال الـدين الأسـنوي، ابن عقيل و السقافي).

یەکێک لە بەرهەمە گرنگەکانی ئەوەیە تەفسیرێکی نووسیەوە بە ناوی (البحر المحيط)، کە لە هەشـت بەرگ پێکهـاتووە، گرنگیەکـی زۆری بەبـواری (نەحـو) داوە، لە سـەر ئایەتەکان دەوەسـتێت و ووشـەکانی شـیدەکاتەوە و، ئەگەر لە واتـایەک زیـاتری هەبێـت باسـی دەکـات، لە تەفسـیرەکەیدا باسـی هۆکـاری دابەزینی ئایەتەکـان دەکـات و نەسـخ بوونیـان ، پەیوەنـدی ئایەتەکـان بە پێشـی خۆیـان و دوای خۆیـان، باسـی قیرائـاتە جیاوازەکـان دەکـات و ووتە شـازەکانیش دەهێنێـتەوە و، ووتەی سـەلەف و خەلەفـیش دێنێتە پێش بـۆ ڕوونکـردنەوەی واتـاکەی، شـەرحی و و ئیعرابی دەکات و ئەوەی نـاڕوونە ڕوونیـدەکاتەوە،هەروەها ووتەی فوقەهـای هەر چـوار مەزهەبەکەو جـگە لەوانـیش دێنێتە پێش لە ئەحکامە شەرعیەکان، بە دەلیلی فیقهی ڕوونیدەکاتەوە.

---

[1]- الصواعق المرسلة (٣/١١٦٦).

**٣- الكشاف عن حقائق التنزيل وعيون الأقاويل في وجوه التأويل، للزمخشري:**

ناوی ئەبو لقاسم محمود کوڕی عمر کوڕی محمد کوڕی عمره، له زەمخشەر لەدایک بووه، لەساڵی (٤٦٧-٥٣٨کۆچی) ژیاوه، لەسەر بیروباوەڕی موعتەزیله بووه، حەنەفی مەزهەب بووه و، شارەزاییەکی باشی هەبووه له نەحو و لوغەو تەفسیرو بەلاغه.

کتێبی (الكشاف)ی داناوه، کەبریتییه له تەفسیری قورئان کۆششێکی زۆری کردووه لەم کتێبەدا بۆ بەرگریکردن له بیروباوەڕی موعتەزیله، به تایبەتی له هەر پێنج بنچیەنەکەی موعتەزیله که لەسەریەتی، که بریتییه له: (توحيد، عدل، الوعد و الوعيد، المنزلة بين المنزلتين، الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر)، توێژینەوه لەسەر هەرئایەتێک لەقورئان بکا لەڕووی بەلاغەوه تاووتوێی بکا، بیروباوەڕی ئیعتیزالەکەی تێدا زەق کردۆتەوه.

بەڵام تەفسیرەکەی لەڕووی لوغەییەوه، ئەو ئیعجازییه لوغەویه جوان و ناوازەیەی که لەقورئانی پیرۆزدا هەیه خستویەته ڕوو و بەجوانی باسی لێوەکردووه، بەهۆی ئەو شارەزاییه فراوانەی که له زانستی لوغەو نەحو و بەیان و صەرفدا هەیبووه، هەروەکو خۆیشی له پێشەکی تەفسیرەکەی ئاماژەی پێدەکات دەڵێت: هەرکەسێک دەست بۆ تەفسیر بەرێ، بیەوێت تەفسیر بنووسێ ڕۆبچێتە ناو بڕێ حەقائیق و وردەکاری تەعبیری ئەو کەلامە مەگەر پیاوێک بێ له دوو عیلمی سەرەکی و گرنگ و تایبەت به قورئاندا شارەزاو ماهیر بێ، ئەو دوو عیلمەش عیلمی مەعان و عیلمی بەیانن.

زانایان ڕەخنەی توندیان له زەمخشەری گرتووه، له تەفسیرەکەی له ڕووی بیروباوەڕە ئیعتیزالەی کەلەسەری بووه، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، دان به شارەزایی ئەم زانایه

دەنێن لە بوارەکانی لوغەو نەحو و بەلاغە و...، ئامۆژگاری ئەوکەسانەش دەکەن کە شارەزای مەزهەبی ئەهلی سوننەن، کێشەیان بۆ دروست نابێت لە کاتی خۆێندنەوەی، ئەتوانن سوودی لێوەربگرن.

***بەناوباگترین کتێبە تەفسیرەکانی سەردەمی تازە:**

**١- الجواهر في تفسير القرآن، للشيخ طنطاوي جوهري:**

شێخی طەنطاوی جەوهەری ڕەحمەتی خوای لێ بێت، زۆر سەرسام بووە بە زانستەکانی کەون و دروستکراوەکانی سروشت و بوونەوەر، عەشقی جوانی و کەمالی ئەوە بووە کە لە ئاسمانەکان و ئەوەی لە زەویدا هەن، هەر ئەمەش بوو وای لە شێخ کردبوو زۆر گرنگی بە ئایەتە کەونیەکان بدات، باسی ئەو وەحیەی خوای پەروەردگار دەکات کە ڕاستی ئەم کەونە دەسەلمێنێت، لە گرنگترین کتێبەکانی لەم بوارەدا: (نظام العالم و الأمم، جواهر العلوم، التاج المرصع، جمال العالم، ونظام الإسلام، الأمة وحياتها)، کتێبەکانی شێخ داواکاری خەڵکی زۆر لەسەر بوو، بڵاوکرایەوەو وەرگێڕا بۆ سەر زمانەکانی تریش.

کەی و چۆن شێخ ئەم کتێبەی نووسی؟

ئەو کاتەی مامۆستا بوو لە قوتابخانەی (دار العلوم) لە میصر، هەندێ ئایەتی بۆ قوتابیەکانی ڕاڤەدەکرد، هەندێکی لە گۆڤاری (الملاجئ العباسين)، پاشان کۆکرانەوە بەم تەفسیرە گەیەنرا.

نوسەر لە تەفسیرەکەیدا ئەوەی ڕوونکردۆتەوە کە موسوڵمان پێویستە بیزانن، لە ئەحکامی شەرعی و ڕەوشتی جوان و سەرسوڕهێنەرەکانی بونەوەر و کەون و

دروســـتكراوەكان، لەســـەر ئەو ئایەتـــانە وەســـتاوەو ڕوونیکـــردووەتەوە کە بـــاس لە زیندەوەران و ڕووەک و، باسی ئاسمانەکان و زەوی دەکەن.

شـێخ طنطـاوی لە تەفسـیرەکەی ئەوە دەچەسـپێنێت کە: لە قورئانـدا زیـاتر لە حەوت سـەدو پەنجـا ئـایەتی عیلمی هەن، ئامۆژگاری موسـوڵمانان دەکات خۆیـان فێربکەن و پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگرن لەو ئایەتە کەونیانە، پێی وایە کە زۆرێک لە خەڵکی لێی بێ ئاگـان، شـێخ لە ووتەکانیـدا لە خۆبـایی بـوونی پێـوە دیـارە، چـونکە شـێخ دەڵێـت: ئەو زانســت و زانیاریــانەی خســتومانن نــاو تەفســیری قورئــان هەمــان ئەو زانســت و زانیاریانەیە کە جاهیل و نەزانە لە خۆبایی بووەکانی فوقەها بچوکەکانی ئیسلام لێی بێ ئاگا بوون.

شێخ پێی وایە خەریکبوون بەلێکۆڵینەوە لەو ئایاتانەدا لە ئێستادا لەهەموو کارێکی تـر لەپێشـترو پێویسـتترە، تەنـانەت لە فەرزە ئاینیەکانیش، شـێخ دەڵێت: خـۆزگە بمزانیـایە بـۆچی قـۆڵی خـۆمان هەڵنەماڵین بـۆ لێکۆڵینەوەو خـۆخەریککردن بە ئـایەتە کەونیەکانی قـورئان، بـۆچی ئەو گرنگییەی بـاوک و بـاپیری ئێمە دابوویـان بە ئایەتەکانی میرات، ئێمە بەهەمان نەفەس و هەمان گرنگی نادەین بە ئایەتە زانستە کەونیەکان؟!

وەهەروەهـا دەڵێـت: بـۆچی زانایـانی ئیسـلام لە بوارەکـانی (فیقهـ)دا چەنـدین کتێبیـان نووسـیوەتەوە، لە کاتێکـدا (علـم الفـقه) لە قورئانـدا چەنـد ئـایەتێکی کەم هـاتووە، کە ناگاتە سـەدو پەنجـا ئـایەت! بـۆچی کتێبێکی زۆر لە (علمی فیقهـ)نوسراوەتەوە، کتێبێکی کەم لە سەر زانستی کەون نوسراوەتەوە و، سورەت نیە باسی کەون نەکات، کە دەگاتە حەوت سەدو پەنجا ئایەت کە هەموویان سەریحن.

تەفسیری جواهری لای ڕۆشنبیران چۆن پێشوازی لێ کرا؟

هەر لەبەر ئەم ووتـانەو جـگە لەمەش کە لە تەفسـیرەکەی شـێخدا هـاتووە      .وە تەفسـیراتی شـێخ بـۆ هەنـدێک لە ئایەتەکـان کە ئەو تەفسـیراتەی هەڵنەدەگـرت و نە هیچێـک لە زانایـانی پێشـینیش بەو شـێوە تەفسـیریان کردبـوو، ئەمە وای لە زۆرێـک زانایان و ڕۆشنبیران کرد کە ڕەخنەی لێبگرن و، ڕەتی بکەنەوە.

**٢- تەفسیری "المنار" ی سەید محمد رشید رضا:**

لە تەڕابلس لە شـام پەروەردە بـووە، چـووەتە خزمەتی زانایـان و پیاوچاکان بـۆ وەرگرتنی زانسـت و زانیاری، وە سـودی لێیان وەرگرتـووە لە زانسـت و ووتەو ئامۆژگاریـیان، جارێک ڕۆژنـامەیەکی بە نـاوی (العـروة الـوثقی) بە دەسـتیەوە دەبێـت، کە لە لەلایەن هەردوو زانای بەناوبانگ شێخ جەمالەدینی ئەفغانی و قـوتابیەکەی محمد عبدە ڕەحمەتی خوایان لێبێـت دەردەکـراو شـتەکانیان تێـدا بڵاودەکـرایەوە، کاتێـک شـێخ محمد ڕەشـید دەیخـوێنێتەوە، زۆر کـاریگەر دەبێـت پێـیان، هەوڵـی ئەوە دەدات بگـات بە خزمەتـی جەمـالەدینی ئەفغـانی بەڵام سـەرکەوتوو نابێـت، دەگـات بە خزمەتـی قـوتـابیەکەی کە شـێخ محمد عەبـدەیە، کە بـۆ یەکەم جـار لە ڕەجەبـی سـاڵی (١٣١٥کـۆچی) پێـیدەگات، یەکەم داوا کە لەشێخی دەکات ئەوەیە کە تەفسیرێک بنوسێتەوە لەسەر ئەو ڕێبازەی ڕۆژنـامەی (العـروة الـوثقی)، ئەو کاتە شێخ محمد عبـدە مامۆسـتا بـوو لە زانکۆی ئەزهەر دەرسـی بە قـوتـابی دەوتەوە، سـەید محمد ڕەشـید دەسـت دەکـات بە خـوێنـدنی تەفسـیری قورئانی پیرۆز لە خزمەتی لە جامیعەی ئەزهەر.

سەید محمد ڕەشید ڕەحمەتی خوای لێبێت، ئامادەی دەرسەکان بوو، لە هەموویان زیاتر سـوورتر بـوو لە وەرگرتنی و نوسینی و لە بەرکردنی، هەندێکی لەوانەی دەنووسیەوە کە وەری دەگـرت، دوای ئەوە هەسـتا بە بڵاوکردنەوەیـان بە نـاو خەڵکیـدا لە ڕێـگەی

ڕۆژنـامەی (المنـار)، بەڵام بڵاوینەدەکـردەوە، تـا ئەو کاتەی مامۆسـتاکەی پێـداچونەوەی بۆ نەکردبایە.

ئەتـوانین بڵێین سـەید محمد ڕەشـید بـوو بە میراتگری یەکەمی شێخ محمد عبـدە، لەوەی کە وەریگرتبـوو لەشـێخ لە ژیـان و دوای مردنیشی، لە سـەر ڕێبـازو مەنهەج و بیروبۆچـوونی شـێخ مـایەوەو لێی لانەئەدا، شـێخ محمد عبـدە لە وەسـفی سـەید محمد ڕەشـید دەڵێـت: هاوبیرم بووە لە عەقیدە و، بیروبۆچوون و ڕەئی، لە ڕەوشت و کرداردا.

سەید محمد ڕەشید تەفسیرێکی نووسی بەناوی (تفسیر القرآن الحکیم) ناسراوە بە تەفسیری (المنار)....، کە لە سەرەتای قورئانی پیرۆز دەست پێدەکات، بە ئایەتی ١٠١ سورەتی یوسـف: ﴿ ۞ رَبِّ قَدْ ءَاتَيْتَنِي مِنَ ٱلْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِي مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَنتَ وَلِيِّۦ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ تَوَفَّنِى مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِى بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠١﴾ ﴾ یوسف: ١٠١

، کۆتایی پێدێت، چونکە مردن ڕێگەی پێنادات تەواوی بکات.

ئەم تەفسـیرە لە (١٢) بەرگـدا چـاپ کـراوە، مامۆسـتا بەهـجەت ئەلبگـار تەفسـیری سـورەتی یوسـفی تەواوکـردووە، لە کتێبێکی سـەربەخۆ چـاپی کـردووەو نـاوی سـەید محمد ڕەشیدی لێ داوە.

سـەرچاوەی سـەید محمد ڕەشـید لەم تەفسـیرەدا ئەوەیە، هەنـدێک ئـایەتی بە ئـایەتی تـر تەفسیر کردووە، بە فەرموودەی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)و، بە قەولی هاوەڵان و تـابعین، بە پێی زاراوەی عەرەب و، پاشـان بە تێگەیشـتنی خـۆی و بیروبۆچـوونێکی سەلیم، بەچاولێکردنی موفەسیرینی پێش خۆی.

سـەید محمد ڕەشـید خـۆی دەڵێـت: کە ئامـانجی لەم نووسـینە ئەوەیە موسـوڵمانان لە قورئـان حـاڵی بـبن لەم ڕووەوە کە: دەسـتووری ئـاینەکە خەڵکـی شـارەزا دەکـات بـۆ گـرتنەبەری ڕێـبازێک کە بەخـتەوەری دونیـاو کـامەرانی قیامەتیـانی تێـدا دەسـتەبەر دەبێت.

### ٣- "في ظلال القرآن"ی سەید قوتب

کە ناسراوە بە (ظلال)، یەکێکە لە کتێبەکانی تەفسیری قورئانی پیرۆز دانەرەکەی سید قوتبە ڕەحمەتی خوای لێبێت، ناوی تەواوی سەید قوتب ئیبراهیم حسین ئەلشـەزەلیە، لە سـاڵی (١٩٠٦- ١٩٦٦) ژیاوە، نوسـەرو بیرمەنـدی ئیسلامی بـووە، لە گونـدی موشـا کە یەکێکە لە گوندەکانی پارێزگای ئەسیوت لە دایک بووە.

(في ظلال القرآن) بە دووشـێوەو قەبارە چـاپکراوە، چاپێکی لە (٦) بەرگـداو چـاپێکی لە (٨) بەرگــدا، تەفســیرێکی مەئثــورە، لایەنەکـانی بەلاغـی و ئەدەبـی و کۆمەڵکـاری لە خۆگرتووە، ئەم تەفسیرە بۆ چەند زمانێک وەرگێڕدراوە.

ئەم زانـا بەڕێزە لەژێر سێبەری قورئانی پیرۆزدا ژیاوە، هەروەکو لە نـاوی تەفسیرەکەیدا دەردەکەوێـت، هەمـوو کەسـێک هەسـت بەو نـیعمەتە ناکـات تـا ئەوکاتەی لە ژێـر ئەو سێبەرە نەژیابێت.

لە پێشـەکی تەفسیرەکەیدا دەڵێت: لە ژێر سایەی قورئاندا کۆتاییم بە فەترەیەکی ژیانم هێنـاو بـڕوای تەواوم بـۆ پەیـدا بـوو کە: چاکسـازی لەم زەویـیەدا نـایەتەدی و ئەم مرۆڤایەتیـیە ڕاحەت و ئاسـوودەیی بە خـۆیەوە نـابینێ و ئەم ئینسـانە دڵ ئـارامی بـۆ دەسـتەبەر نـابێ، سـەرکەوتن و پێشـکەوتن نـایەنەدی پـاکی و گونجـان لە گەڵ

سـونەنەکانی کەونـداو لەگەڵ فیترەتی ژیانـدا نـابینێ، مەگەر بە گەڕانەوەی بـۆ لای خـوا نەبێ. گەڕانەوەش بۆ لای خوا .وەکو لە (في ظلال القرآن)دا دەردەکەوێ .یەک شێوەو یەک وێنەی هەیە، یەک ڕێگای هەیەو بەس!.

بێگومـــان ئەو گەڕانەوە، گەڕانەوەیە بە ژیـــان لە هەمـــوو بوارەکانیـــداو بە هەمـــوو جۆرەکـانیەوە بـۆ مەنهەج و دەسـتوری خـودا، ئەو مەنهەجەی کە خـودا بـۆ خـۆی نەخشـەی کێشـاوە بـۆ مرۆڤـایەتی، لە نـامەی پیرۆزی خۆیـدا وێنـای کـردوە، ئەویـش بریتیـیە لەوەی ئەو نـامەیەی کە نـاوی قـوڕئـانە لەژیـانی خۆیانـدا جێبەجێی بـکەن و بیکەنە داوەرو پابەنـدبن و بە موو لێی لانەدەن و هەموو کاروبـارێکی ژیانیـان بە پێی ئەو نامە خوداییە جێبەجێ بکەن.

ئەگینا فەسادو گەندەڵی لە زەویدا بەرپا دەبێت، بەدبەختی و چارەڕەشی سواری شـانی مرۆڤـایەتی دەبێـت، مرۆڤەکان هەموویـان لە نـاو زەلکاوی ژیانـدا، لە نـاو قـوڕدا لە ژێـر سـایەی جـاهیلی و نەزانیـدا کـات بەڕێـدەکەن، بەدبەختی و چـارە ڕەشـی بـۆ خۆیـان دەهێنـــنە دی، جاهیلیـــەتێک بـــاڵا دەســـت دەبێـــت، لە جیـــاتی خـــودا هەواو ئـــارەزو دەپەرسترێت.

سـەید ڕەحمەتـی خـوای لێبێـت، لە تەفسـیرەکەیدا گەڕاوەتەوە بـۆ سـوننەتی قەولی[1] پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وە هەروەهـا لەسـەر ئایەتە مەکییەکان ڕاوەستاوەو لایەنە عەقیدەیـــیەکەی ڕوونکـــردووەتەوە، هەروەهـــا لەســـەر ئـــایەتە مەدەنیەکـــان وەسـتاوەو ئەحکـامە شـەرعیەکانی ڕوونکـردووەتەوە، جـگە لەوەش لایەنـی بەلاغـی و

---

١- هەموو ئەو ووتانەیە کەلە پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) گێڕدراوەتەوە.

ئیعجاز، سەبەب نزول و ناسخ و مەنسوخ، موحکەم و موتەشابیهـ، و زانستەکانی تری قورئانی تێدا ڕوونکردووەتەوە، ڕووداوە مێژووییەکانی باس کردووەو ڕوونیکردونەتەوە. ڕۆشنبیران پێشوازیەکی باشیان لێکردووە، کەم کتێبخانە هەیە ئەم تەفسیرەی تێدا نەبێت.

***تەفسیری فوقەها:**

قورئانی پیرۆز کە دابەزیوە، کۆمەڵێک ئایەتی فیقهی لە خۆگرتووە کە پەیوەستە بە بەرژوەندی بەندەکانەوە بۆ دونیاو دوارۆژیان، موسوڵمانان لە سەردەمی پێغەمبەری نازدار لەم ئایەتانە تێگەیشتوون بە پێی ئەوەی شارەزای زمانی عەرەبی بوون، ئەگەر ناڕوونیەکیان بۆ دروست بوایە دەچوونە خزمەتی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

لە دوای کۆچی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خەڵکی دەهاتنە خزمەتی هاوەڵان بۆ پرسیاری شەرعی، ئەو پرسیارانەش کە ڕووبەروویان دەکرایەوە بریتی بوو لە هەڵێنجانی حوکمە شەرعیەکان لە قورئانی پیرۆز، هاوەڵانیش لە ئایەتەکانیان ئەڕوانی بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارە شەرعیەکانیان، ئەگەر نەبوایە بۆ سونەتی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگەڕانەوە، ئەگەر لە سونەت نەبوایە بە پێی تێگەیشتن و ئیجتیهادیان لە قورئان و سوننەت، حوکمە شەرعیەکانیان تێدا دەردەهێنا.

هاوەڵان لە دەرکردنی حوکمە شەرعیەکان هەندێکجار ڕەئی و بۆچوونیان یەک بووە، هەندێکجار ڕاجیایان بووە لە سەر حوکمێکی شەرعی، بۆ نمونە وەکو ڕاجیایی نێوان ئیبنو عەباس و زیدی کوڕی سابیت ڕەزای خوایان لێبێت، لە مەسلەی میراتدا، لەوەی کەسێک بمرێت (مێرد و دایک و باوک) لە دوای خۆی بە جێبهێڵێت، ئیبنو عەباس دەڵێت: مێردەکەی نیوە دەبات، دایک یەک لەسەر سێ دەبات، ئەوەش کە ماوەتەوە

ی باوکەکەیە، وە ئەم ئایەتەش بە بەڵگە دەهێنێتەوە: ﴿ فَإِن لَّمۡ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٞ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُۚ ﴾ النســـاء: ١١، زەید دەڵێت: دایکەکە پاشماوەی یەک لەسەر سێ دەبات لە دوای فەرزی پیاوەکە، چونکە حیسابی نێرو مێیان بۆ کردووە، وە نێریش دوو ئەوەندەی مێ دەبات.

**- هەندێک لە تەفسیری فوقەها:**

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ نوسراوەکانی تەفسیری فیقهی، شتێکی وامان دەست ناکەوێت پێش سەردەمی تەدوین"کۆکردنەوەو نوسینەوەی"لە سەدەی دووەمی کۆچی دەستکرا بە نووسینەوە و کۆکردنەوەی کتێب لە بوارە شەرعیەکان.

لەدوای سەردەمی تەدوین زۆرێک لە زانایان کتێبیان نووسیەوە لە مەزهەبی جیاجیاو بواری تەفسیری فیقهی، کە ئەمانەن:

**١- مەزهەبی ئیمامی ئەبو حەنیفە:**

ئەبو بەکری ڕازی کە ناسراوە بە جەصاص، لە ساڵی (٣٧٠کۆچی) کۆچی دوایی کردووە، (أحكام القرآن)ی نووسیوە، لە سێ بەرگی گەورەدا چاپکراوە، کە ئێستا لەبەردەسی خوێنەراندایە.

وە ئەحمەدی کوڕی سەعید لە زانایانی سەدەی(١١کۆچی)یە، تەفسیری (الأحمدية في بيان الآيات الشرعية)ی نوسیوە، لە هیند لە بەرگێکی گەورەدا چاپکراوە و نوسخەیەکی لە کتێبخانەی ئەزهەرە.

### ٢- مەزهەبی ئیمامی شافعی:

ئەبو حەسـەنی تەبەری، ناسـراوە بە (كيـا الهراسي) لە سـاڵی (٥٠٤كۆچی) كۆچی دوایی كردووە، كتێبی (أحكام القرآن)ی نووسیوە، چاپكراوە لە بەرگی گەورەدا، لە دار الكتب مصره لە كتێبخانەی ئەزهەر.

شـەهابەددین ئەبـو عبـاس ئەحمـدی كـوڕی یوسـفی كـوڕی محمد حەلەبـی، ناسـراوە بە(سـمين) لە سـاڵی (٧٥٦كـۆچی) كـۆچی دوایـی كـردووە، تەفسـیری (القـول الـوجيز في أحكام الكتاب العزيز)ی نووسیوە، لە كتێبخانەی ئەزهەرە، جـوزئی یەكەمی كە كۆتایی پێهـاتووە لە ئـایەتی (١٩٤) ی (البقـره): ﴿ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُوا۟ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ۚ ﴾

عەلـی كـوڕی عەبـدواللە مەحمـود الشـنفكی، لە زانایـانی سـەدەی (٩)ی كـۆچیە، تەفسـیری: (أحكـام الكتـاب المبـين) نووسـیوە، لە كتێبخـانەی ئەزهەرە، لە بەرگێكـی مامناوەندا.

جەلالەدینی سیوتی، كەلەساڵی (٩١١كۆچی) كۆچی دوایی كردووە، (الإكليل في استنباط التنزيل)ی نووسیوە، لە كتێبخانەی ئەزهەرە، لە بەرگێكی مامناوەند چاپكراوە.

### ٣- مەزهەبی ئیمامی مالیک:

ئەبـو بەكـری كـوڕی عەرەب ٠(ابـن العربـي)، كە لەسـاڵی (٥٤٣كـۆچی) كـۆچی دوایـی كردووە، (أحكام القرآن)ی نووسیوە لە دوو بەرگی گەورەدا چاپكراوە.

ئەبـو عەبـدوالله قورتـوبی، کە لە سـاڵی (٦٧١ کـۆچی) کـۆچی دوایـی کـردووە، (الجـامع لأحکام القرآن) نووسیوە، لە دار الکتب المصریة چاپکراوە، کە ١٤ جوزئی تائێستا لێ چاپکردووە.

**٤- مەزهەبی زەیدی:**

حسـین کـوڕی ئەحمـدی النجـری، لە سـەدەی ٨کـۆچی ژیـاوە، شـەرحی (٥٠٠) ئـایەتی کردووە، بەڵام ئەم تەفسیر نەگەشتۆتە دەستی ئێمە.

شەمسەدینی کوڕی یوسفی کوڕی ئەحمەد لە زانایانی سەدەی ٩ی کۆچیە، (الثمرات الیانعة والأحکام الواضحة القاطعة)ی نووسیوە، نوسخەیەکی لە دارالکتب المصریة، لە سێ بەرگدا چاپکراوە.

محمدی کوڕی حسینی کوڕی قاسم، لە زانایانی ١١ی کۆچیە، (منتهی المرام) شەرحی آیات الأحکامی نووسیوە.

**٥- مەزهەبی ئیمامی، (الإثنا العشریة):**

مقدادی السیوری، لە زانایای سەدەی ٨ی کۆچیە، (کنز الفرقان في فقه القرآن)ی نووسیوە، نووسخەیەکی لە دار الکتب المصریة چاپکراوە لە بەرگێکی بچوکدا.

لە گرنگترینی کتێبەکان کەباسمان کرد ئەمانەن:

**١- أحکام القرآن. جەصاص، (مەزهەبی ئیمامی ئەبو حەنیفە):**

نووسەری ئەم تەفسیرە، کە ئەبو بەکر، ئەحمەدی کوڕی ڕازیە، ناسراوە بە جەصاص، لە ساڵی (٣٠٥کۆچی) لە بەغداد لە دایک بووە.

لەسەر ڕێبازی ئیمامی ئەبو حەنیفە بووە، بۆ وەرگرتنی زانست چووەتە خزمەتی ئەبی سهل الزجاج، ئەبی حەسەنی کەرخی و هەندێکی تر لە زانایانی سەردەمی خۆی.

ئەم زانا بەڕێزە خاوەنی چەند کتێبێکی بە نرخە، گرنگترینیان (أحكام القرآن، شرح مختصر الكرخي، شرح مختصر الطحاوي، شرح الجامع الكبير، كتاب أصول الفقه)، هەندێک کتێبی تر.

زۆر بەرگریکاری ڕێبازی ئیمامی ئەبو حەنیفە بووە، بە لـُگەی بۆ ئەهێنانەوە و ساڵی ٣٧٠کۆچی، کۆچی دوایی کردووە.

.پێناسەیەکی تەفسیرەکەی: ئەم تەفسیرە یەکێکە لە گرنگترین تەفسیرە فیقهیەکان، بە تایبەتی لای حەنەفیەکان، چونکە گرنگیەکی بەو مەزهەبە داوە، بەرگری لێکردووە لەم تەفسیرەدا تەفسیری ئەو ئایەتانەی کردووە کە پەیوەندی بە ئەحکامی شەرعیەوە هەیە.

جەصاص دەمارگیرێکی سەرسەختی مەزهەبی ئیمامی ئەبو حەنیفە بووە، ئەم دەمارگیریە وای لێکردبوو کە تەئویلی هەندێک ئایەت بکات، کە تەئویلێکی نادروست بوو، بۆ ئەوەی مەزهەبەکەی خۆی پێ سەربخات، بەڕوونی ڕوحێتی دەمارگیری لە تەفسیرەکەیدا دەردەکەوێت.

جەصاص لە تەفسیرەکەیدا وا دەردەکەوێت کاریگەر بووە بە بیروباوەڕی موعتەزیلە، لە تەفسیری ئایەتی: ﴿ لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ ﴾ الأنعام: ١٠٣، دەڵێت: ماناکەی ئەوەیە، چاو نایبینێت، ئەمە جۆرە مەدحێکە بەوە کە نەفی بینینی دەکات بە چاو، وەکو چۆن دەفەرمووێت: ﴿ لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٞ وَلَا نَوۡمٞۚ ﴾ البقرة: ٢٥٥، هەرشتێک خودا بە نەفی کردنی لە خۆی مەدح بێ، بێگومان چەسپاندنی دژەکەی زەم و نەقصە، بە هیچ حاڵێک دروست نیە ئیسباتی دژەکەی بکەین. جا کەخودا مەدحی خۆی دەکات بەوەی بە چاو نابیندرێ، بە هیچ جۆرێک دروست نییە پێچەوانەکەی ئیسبات بکەین بۆی،

چـونکه بەوە سـیفەتی نەقـص بـۆ خـودا بڕیـار دەدەیـن. دروسـت نیـیه بڵێین: ئـایەتەکە تـایبەت دەکرێ بە ئـایەتی: ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ ﴾ القیامـــة: ٢٢ - ٢٣

• ئیحتیمـالی چەنـد مانـایەکی هەیە، لەوانە: چاوەڕوانی پاداشـت، وەکو لە کۆمەڵێک لە عولەمـای سـەلەفەوە ڕیـوایەتکراوە، جـا کە ئیحتیمـالی تەئـویلی هەبـوو دروسـت نیـیه بیکەی بە ئیعتیراض و ڕەتدانەوە بۆ سـەر شـتێک: کە ڕێگای تەئویل کردنی تێدانەبێت، ئەو هەواڵانەی دەربـارەی بینینی خـودا ڕیـوایەتکراون ـ ئەگەر صـەحیح بـن ـ مەبەسـت لێیـان زانیاریـیه، واتە زانیـارییەک کە شـوبهەو گومـانی تـێکەڵاو نەبـن شـک و ڕاڕای تێـدا نەبێت، چونکە ووشـەی(رؤية) لە زمانەوانی بە واتای: عیلم و زانیاریش هاتووە.

### ٢- أحكام القرآن .لكيا الهراسي، (الشـافعي):

ئەم تەفسـیرە هی عیمـادەدین، ئەبـو حەسـەن عەلی کوڕی محمدی کوڕی عەلی تەبەریە، ناسراوە بە(کیا هراسي)، فەقیهی شـافیعییە، لە ساڵی (٤٥٠کۆچی) لە دایک بووە.

خـۆی خوراسـانیه، پاشـان کـۆچی کـردووە بـۆ نیسـاپور، چـووەتە خزمەتـی ئیمـامی حەرەمەیـن جـوەینی بـۆ وەرگرتنی زانسـت و زانیـاری، پاشـان دەچێـتە عێـراق، لە قوتابخـانەی نیزامیە لە بەغـداد وانە دەڵێـتەوە، لە سـاڵی (٥٠٤کـۆچی)، کـۆچی دوایـی دەکات.

ئەم زانـا بەڕێـزە قسـە خـۆش بـووە و، مـوحەدیس بـووە، فەرمـوودەی دەگێـڕایەوە لە دانیشتن و کۆڕەکاندا.

پێناسەیەکی تەفسیرەکەی:

یەکـێکە لە گرنگتـرین تەفسـیرەکان لە تەفسـیری فیقهـی لای شـافعیەکان، شـێخ عیمـادەدین ئەو دەمارگیرەیـیەی نەبـووە، بە پێی ئەوەی جەصـاص ئەو دەمـارگیریەی هەبووە بۆ مەزهەبی ئیمامی ئەبو حەنیفە، تەفسیری ئەو ئایەتانەی کردووە، موافقی مەزهەبی ئیمامی شافعی بووە و، ڕوحێتی دەمارگیری تێدا ڕەنگینەداوەتەوە.

لە پێشـەکی تەفسیرەکەیدا دان بەوەدا دەنێت کە: مەزهەبی ئیمامی شافعی ڕەحمەتی خوای لێبێت، لە چاکترینی مەزهەبەکانە، لە ڕووی حوکمەکانی، چونکە ئیمامی شافعی لە زۆرینەی بیروبۆچوونەکانی خۆی پاراستووە لە گومان و خەمڵاندن، بۆچونەکانی گەیاندۆتە ڕێژەی یەقین.

لە تەفسیرەکەیدا بەرگری کردووە لە قەواعیدو بنچینەکای مەزهەبی ئیمامی شافیعی، تەئویلی تێدا کردووە، بەڵام ئەمە بەس نیە بۆئەوەی بڵێین دەمارگیر بووە بۆ مەزهەبی ئیمامی شافعی.

**٣- أحكام القرآن. ئیبنول عەڕەبی، (المالكي):**

نـاوی قاضـی ئەبـو بەکـر محمد کـوڕی عبـدالله ی کـوڕی محمدی کـوڕی عبـدالله ی کـوڕی ئەحمدی معارفی، خەڵکی ئەندەلوسە لە ئەشبیلیا، پێشەواو دەریایەک بووە لە زانست و زانیاری، کۆتا زانای ئەشبیلیایە، باوکی لە فوقەهای ئەشبیلیایە.

لە سـاڵی (٤٦٨کۆچی) لە دایک بـووە، پاشـان چـووەتە مصـر و پاشـان شـام و بەغـدادو مەککە، زانست و زانیاری لەو زانایانەی ئەو وڵاتە وەرگرتووە کە چووە بۆی، تا شارەزای باشـی لە فیقهــ و أصـول و فەرمـوودەو، شـارەزای لە خـیلاف و تەفسـیر و ئەدەب و

شیعر.. وەرگرتووە، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ ئەشبیلیا بە زانست و زانیاریەکی زۆرەوە، کە هیچ کەسێک لە پێش ئەم نەیبووە.

ئیبنول عەرەبی لە تەفسیرەکەیدا پیاوێکی میانڕەو و خاوەن ویژدانە، دەمارگیری بۆ مەزهەبی خۆی تێدا نیە، بۆ ڕەتدانەوەی ڕای دژەکانی توندڕەوی بەکارناهێنێت، وەکو جەصاص پەیڕەوی کردووە، هەرچەندە چاوی قوچاندووە لە هەموو هەڵەیەکی زانستی کە لە موجتەهیدێکی مالیکییەوە سەری هەڵدابێت.

ئیبنو لعەرەبی لە تەفسیرەکەیدا ڕاو بۆچوونی زانایان لەسەر تەفسیری ئایەتەکە باس دەکات و تەنها ئەو ئایەتانە تەفسیر دەکات کە ئەحکامی شەرعیان لە خۆگرتووە، بەیانی ئیحتیمالاتە جۆراوجۆرەکان دەکات: کەمەزهەبە فیقهییەکان خستویاننە ڕوو، خاڵ بەخاڵ تەفسیری ئایەتەکە دەکات و بۆ هەموو خاڵێک ناونیشانێک دادەنێت، بۆنمونە دەڵێت: (المسألة الأولى... المسألة الثانية...) ئاواو بەوجۆرەو زۆر بەکەمی لە ڕەددانەوەی موخالیفەکانیدا توندڕەوی بەکاردێنێت، بۆ نموونە لە تەفسیرکردنی ئـــایەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ ﴾ المائدة: ٦، دەڵێت: مەسئەلەی یانزەهەم فەرموودەی خودا (فاغسلوا)، شافیعی .کە لەلای هاوەڵانی وەکو (محمد بن عدنان)وایە لە ڕەوانبێژیدا بەڵکو ئەو و ئەبو حەنیفەو جگە لەویش پێیان وایە وشەی (غسل) بریتییە لەوەی ئاو بەو شتەدا بکەی کە دەیشۆی بە بێ دەست لێخستن. بێگومان ئێمە لە مەسائیلی خیلافدا پوچی ڕاوبۆچوونی ئەو زاتانەمان بەیان کرد، هەروا لە سورەتی (النساء)یشدا ئەوەمان خستە ڕوو کە: ڕەئیەکەیان فاسیدەو وانیەو ئەوەمان چەسپاند کە (غوسل) بریتییە لە ئاو پێداکردنی ئەو شتەی دەتەوێ بیشۆی و وێڕای دەست لیخستن و هەڵگڵۆفین و شتی وا.

ئیبنول عەڕەبی لە تەفسیرەکەیدا بۆ دەرهێنانی ئەحکام، هەمیشە لوغەت دەکات بە حاکم و لەوێوە زانیارەکانی خۆی ئاڕاستە دەکات و خۆی دەپارێزێت لە ئیسرائیلیات و داوا دەکات ئەو جۆرە ڕیوایەتانە ڕەتبکرێتەوەو نەخرێنە ناو باس و لێکۆڵینەوە، هەروەها ڕەخنەی بنیاتنەر لە فەرمووددەی لاواز دەگرێت و هۆشداری دەدا لەوەی پەنای بۆ ببرێت و بکرێتە کەرەسەی باسی ناو تەفسیر.

ئەم تەفسیرە چەند جارێک چاپکراوەو هەندێکجار لە دووبەرگداو هەندێکجار لە چوار بەرگداو بە ئاسانی لەبەردەستی خوێنەراندایە.

**٤- الجامع لأحكام القرآن لأبي عبدالله القرطبي، (المالكي):**

ئەبو عبداللە محمد کوڕی ئەحمدی کوڕی ئەبی بەکری کوڕی فەرح، ئەنصاری، خەزرەجی ئەندەلوسی.

ئەم زانا بەڕێزە ڕەحمەتی خوای لێبێت، کەسێکی زاهید بووە، هەندێکجار گەڕاوە یەک پۆشاکی لەبەر بووە، هەمووکاتەکانی خەریکی عیبادەت بووە، هەندێکجار بە نووسینەوە خەریک بووە، لە ساڵی (٦٧١کۆچی)، کۆچی دوای کردووە.

پێناسەیەکی تەفسیرەکەی:

شێخی قورطوبی لە تەفسیرەکەیدا تەنها تەفسیری ئایەتەکانی ئەحکامی نەکردووە، تەفسیری هەموو قورئانی بە تەرتیب کردووە، باسی چیرۆکەکان و مێژووی تێدا نەکردووە، ئیسباتی ئەحکامە شەرعیەکانی کردووەو و هەڵێنجانی بۆ دەلیلەکان کردووە، باسی قیرائەتەکان و ئیعراب و ناسخ و مەنسوخی کردووە.

شێخی قورطبی لە باسی ئایەتی ئەحکامدا، بۆ نموونە: ﴿ أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ ﴾ البقرة: ١٨٧

• له مەسـەلەی دوانزەهەمی تەفسـیری ئـایەتەکەدا، باسـی خیلافی زانایـان دەکات لە سـەر حـوکمی کەسـێک لە ڕۆژی ڕەمەزانـدا لە بیری بچێت، کە بەڕۆژووە شـت بخـوات، ئەوە دێنێ کە لای ئیمامی مالیکە دەڵیت ئەبێت ڕۆژووەکە بگرێتەوە، دەڵێ بە لای غەیری مـالیکەوە ناشـکێت، هەرکەسێ کە نەزانێ بەڕۆژووە شـت بخـواو بخـواتەوە ناشـکێت، دەڵێـت: مـن ئەم بۆچـوونەم پێ دروسـتە. ئەم فەرمـوودەیە بە دەلیـل دەهێنێـتەوە، کە ئەبو هـوڕەیرە ڕیوایەتی کـردووە لە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرمووێت: (إذا أَكَلَ الصَّائمُ ناسِيًا، أو شرِبَ ناسِيًا، فإنَّما هو رِزقٌ ساقَه اللهُ إليه، ولا قَضاءَ عليه...).
لێرە دەبینـین کە شـێخ بەم ڕایە پـێچەوانەی مەزهەبـی خـۆی بڕیـاری داوەو بە ئەوپەڕی بەرپرسـیارییەوە ویژدانی بەکار هێنـاوەو مـافی داوە بەکەسـانی تـر، کە لەسـەر مەزهەبی ئەو نین.
شـێخی قـورطبی لە بـواری عەقیدەشـدا ڕەددی فیرقەکانی داوەتەوە، وەکـو مـوعتەزیلەو قەدەری و ڕافیزەو فەلاسیفەو سۆفی توندڕەوە غولاتەکان.
ئەم تەفسـیرە (دار الكتب المصرية) بە چـاپی گەیانـدووە، بە چەنـد قەبارەیەکی جیاجیـا لە بەردەستی خوێنەراندایە.



هەندێک لەو قاعیدەو یاسایانەی موفەسیر پێویستی پێیانە:

ڕوونە ئەو کەسەی کە ڕاڤەی قورئانی پیرۆز دەکات، ئەبێ شارەزایەکی باشی هەبێت لە قەواعیدی عەرەبیدا، وەکو نەحو، صرف، بەلاغە،....، بەبێ ئەمانە موفەسیر ناتوانێت پەییان پێببات، ئیستاش هەندێک لەو یاسانە باس دەکەین:

**(الضمائر) ڕاناوەکان:**

ڕاناو بۆ کورت کردنەوەی لەفزە، جاری وا هەیە ڕاناوێک لەبری کۆمەڵە ووشەیەک دێت، بێ ئەوەی واتاکەیشی تێکبچێت و دووبارە بوونەوەیشی تێناکەوێت. وەکو خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمٗا ٣٥ ﴾ الأحزاب: ٣٥، ڕاناوی (لهم) جێگەی بیست ووشەی گرتۆتەوە ئەگەر ئەم ڕانەوە دانەنرێت ئەبێت ئەم بیست وشەیە بنوسرێت کە ئەمانەن لە ئایەتی (٣٥) ئەحزابدا هاتوە: ﴿ إِنَّ ٱلۡمُسۡلِمِينَ وَٱلۡمُسۡلِمَٰتِ وَٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ وَٱلۡقَٰنِتِينَ وَٱلۡقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلۡخَٰشِعِينَ وَٱلۡخَٰشِعَٰتِ وَٱلۡمُتَصَدِّقِينَ وَٱلۡمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلۡحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمۡ وَٱلۡحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرٗا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمٗا ٣٥ ﴾ الأحزاب: ٣٥ پێویستە ڕاناوی غائیب مەرجەع و موفەسیرێکی هەبێ، بەڵام زانایانی نەحو دەڵێن لە (متكلم) قسەکەر وە لە (مخاطب) کەسی بەرامبەر(دوێنراو)، پێویستی بە موفەسیر نیە، چونکە ئەم دوو حاڵەتە موشاهەدەو . بەرچاوی . تەفسیردەکەنەوە.

له ڕاناوی غائیبدا ئەو مەرجەعەی کە بۆی دەگەڕێتەوە، دەبێت هاوشانی یەکتر بن لەڕووی نێرو مێ و تاک و دووان و کۆدا، وەکو خوای پەروەدگار دەفەرمووێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوا۟ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ ۚ ٱعْدِلُوا۟ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾ ﴾ المائدة: ٨، لێرەدا ڕاناوی (هو) دەگەڕێتەوە بۆ (عدل) کە لە لەفزی (إعدلوا)لەخۆی گرتووەو دەگەیەنێ.

جاری واهەیە لەڕوی لەفزەوە – نەک لەڕووی پلەوە - مەرجەعی ڕاناوی غائیب دەکەوێتە دواوە، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ فَأَوْجَسَ فِى نَفْسِهِۦ خِيفَةً مُّوسَىٰ ﴿٦٧﴾ ﴾ طه: ٦٧، لێرەدا ڕاناوی (فِي نَفْسِهِ)ی دەگەڕێتەوە بۆ(موسی)کە لەڕووی لەفزەوە کەوتۆتە دوای ڕاناوەکە، بەڵام (موسی) فاعیلە، فاعیلیش ڕوتبەو پلەی لە پێشەوەیە.

یان سەرچاوە(مەرجەع)ی ڕاناوەکە لە تێفکرین لە سیاقی کەلامەکە دەزانرێت، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ ﴾ الرحمن: ٢٦، ڕاناوەکە لە(علیها)دا دەگەڕێتەوە بۆ (الأرض) واتە: (کل من علی الأرض فان)، هەروەها ئایەتی: ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَـٰهُ فِى لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ ﴿١﴾ ﴾ القدر: ١، لەسیاقی کەلامەکە دەزانین: کە ڕاناو لە (أنزلناه) دا دەگەڕێتەوە بۆ (القرآن).

هەنـدێکجار ڕانـاو لەگەڵ مانـاکەی موتـابقی یەکتـر نـین، وەکـو خـوای پەروەردگـار دەفەرمووێــت: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن سُلَـٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَـٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾ ﴾ المؤمنــــــــــون: ١٢ – ١٣، ڕانـاوەکە لە(جعلنـاه) دەگەڕێـتەوە بـۆ (الإنسان)نێکی تر مەبەست لێ (الإنسان)ی یەکەم نیە.

هەنـدێکجار ڕانـاو دەگەڕێـتەوە بـۆ مانـا بەتەنهـا، خـوای پەروەردگار دەفەرمووێـت: ﴿ وَءَاتُوا۟ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَـٰتِهِنَّ نِحْلَةً ۚ فَإِن طِبْنَ لَكُمْ عَن شَىْءٍ مِّنْهُ نَفْسًا فَكُلُوهُ هَنِيٓـًٔا مَّرِيٓـًٔا ﴿٤﴾ ﴾ النســــاء: ٤، ڕاناو لە(منه)دا دەگەڕێتەوە بۆ سـەر مانـای (صـدقات)، چـونکە لەمانـای (صـداق) یـان لەمانـای (ما أصـدق)دایە وەکـو ئەوە وایە کە فەرمـووبێتی: (واتـوا النسـاء صداقهن أو ماأصدقتموهن).

وەئەگەر چەند ڕاناوێک کۆبوونەوە لە یەک کاتدا، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ ﴿٥﴾ ذُو مِرَّةٍ فَٱسْتَوَىٰ ﴿٦﴾ وَهُوَ بِٱلْأُفُقِ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٧﴾ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ﴿٨﴾ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ﴿٩﴾ فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ ﴿١٠﴾ ﴾ النجم: ٥ – ١، ڕاناوەکان لێرەدا دەگەڕێتەوە بۆ (شَدِيدُ الْقُوَى) کە جبریلە علیه السلام، ئەبێت ڕاناو بۆ نزکترین باسکراو بگەڕێتەوە، تەنها لەکاتی موزافدا نەبێت لەو کاتەدا دەگەڕێتەوە بۆ موزاف.



## گشتی و تایبەت

## (الخاص و العام)

پێناسەی گشتی: لەفزێکە داگرندەی هەموو تاکێکە کە بۆی بگونجێ بەبێ سنورو ئەژمار.[1]

وەکو خوای پەروەدگار دەفەرمووێت: ﴿ ٱلزَّانِى لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ ۚ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾ ﴾ النور: ٣، هەروەها: ﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓا۟ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٣٨﴾ ﴾ المائدة: ٣٨، لێرەدا حوکمی ئایەتەکە گشتییە(عامە)، هەموو کەسێکی زیناکەر یان هەموو کەسێکی دز دەگرێتەوە.

- چەند صیغەو دارێژگەیەک هەن دەلالەت دەکەن لەسەر (عموم) گشتێتی:

١- (كل) بەهێزترین صیغەیە بۆ گشتی،[2] وەکو خوای پەروەدگار دەفەرمووێت: ﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ۗ ﴾ آل عمـــران: ١٨٥، ﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ ۖ ﴾ الزمر: ٦٢

٢- بەناوێکی ناسراو، ناوێک کە (ال)ی چوبێتە سەری (ال) بۆ عەهد نەبێت.

---

١- الدراسات، ل١٢٢٠.

٢ - الدرسات، ل١٢٢٤.

وەكو خواى پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ وَٱلۡعَصۡرِ ۝١ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ۝٢ ﴾ العصر: ١ – ٢، وەهەروەها: ﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقۡطَعُوٓاْ أَيۡدِيَهُمَا جَزَآءَۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلٗا مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ۝٣٨ ﴾ المائدة:٣٨[1]

٣- نەكیرە (نەناسراو) لەسیاقى نەفى، یان نەهى.

وەكو خواى پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفّٖ وَلَا تَنۡهَرۡهُمَا ﴾ الإسراء: ٢٣، یان نەكیرە لەدواى ئەداتى شرط(مەرجى)، وەكو خواى پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ وَإِنۡ أَحَدٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٱسۡتَجَارَكَ فَأَجِرۡهُ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ﴾ التوبة: ٦[2]

٤- ناوەكانى مەرج(أسماء الشرط)، وەكو خواى گەورە دەفەرمویت:﴿ وَمَن قَتَلَ مُؤۡمِنًا خَطَـٔٗا فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ مُّؤۡمِنَةٖ ﴾ النساء: ٩٢.

٥- هەموو شتێك پاڵبدرێت بۆ لاى ناسراوێك، خواى گەورە دەفەرمویت:﴿ فَلۡيَحۡذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنۡ أَمۡرِهِۦٓ ﴾ النور: ٦٣[3]

**جۆرەكانى گشتى (عام):**

جۆرەكانى گشتى سێ جۆرە:

---

١- الدراسات، ل١٢٢٩.

٢- الدراسات، ل١٢٣٠.

٣- الدراسات، ل١٢٢٩،١٢٢٦.

١- ئەوەیە کە لەسەر گشتێتی خۆی مابێتەوە تەخصیص ڕووی تێنەکردبێت.

وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ ﴾ الزمـر: ٦٢، ﴿ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ١٧٦ ﴾ النساء: ١٧٦[1]

٢- وشەی عام مەبەستی لێ خاص بێت.

وەکو خـوای پەروەردگار دەفەرموێت ﴿ ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدۡ جَمَعُواْ لَكُمۡ فَٱخۡشَوۡهُمۡ فَزَادَهُمۡ إِيمَٰنٗا وَقَالُواْ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ وَنِعۡمَ ٱلۡوَكِيلُ ١٧٣ ﴾ آل عمران: ١٧٣، مەبەسـت بە وشـەی (النـاس)ی یەکەم نەعیمی کـوڕی مەسـعودە، مەبەسـت بە وشەی (الناس)ی دووەم ئەبو سوفیانە، مەبەست پێیان عموم نیە، بە بەڵگەی ئەوەی پاشان دەفەرموێت: ﴿ إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ ﴾ آل عمران: ١٧٥[2]

٣- گشتیەو تخصیص کراوە،نمونەی ئەمە لە قورئانی پیرۆز زۆرە.

وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلۡخَيۡطُ ٱلۡأَبۡيَضُ مِنَ ٱلۡخَيۡطِ ٱلۡأَسۡوَدِ مِنَ ٱلۡفَجۡرِۖ ﴾ البقرة: ١٨٧



---

١- الدراسات، ل١٢٣٤.

٢ - الدراسات، ل١٢٣٩.

خاص (تايبەت):

پێناسەی خاص: بەرامبەری عامە پێچەوانەی یەکترن، تاکێتی دەگەیەنێت و پچڕاوە لە بەشداریکردن، هەموو لەفزێک دەگەیەنێت کە دانرابێت بۆ واتایەکی تاک.

**خاص دەکرێتە دووبەش، کەئەمانەن:**

یەکەم: .المخصص المتصل (تایبەتی لکاو)، ئەمە بە سەربەخۆیی نایەت، بەڵکو لەگەڵ عامەکە باس دەکرێت.

وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ۝٣٣ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِن قَبۡلِ أَن تَقۡدِرُواْ عَلَيۡهِمۡۖ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ۝٣٤ ﴾ المائدة: ٣٣ - ٣٤

المخصص المتصل (تایبەتی لکاو) پێنجن، کە ئەمانەن:

١- ئیستیثنایە، وەکو پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ۝٣٣ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِن قَبۡلِ أَن تَقۡدِرُواْ عَلَيۡهِمۡۖ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ۝٣٤ ﴾ المائدة: ٣٣ – ٣٤

٢- صیفەیە، وەکو پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿ وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّٰتِي دَخَلۡتُم بِهِنَّ ﴾ النساء: ٢٣، ڕستەی (ٱلَّٰتِي دَخَلۡتُم بِهِنَّ) صیفەتی (نیسائکم)ە، واتە کۆڵەبەسەی ئەو ئافرەتانەی سەرجێیتان کردوون لێتان

حەرامە مارەیان بکەن، بەڵام ئەگەر دخولتان بەدایکەکانیان نەکردبێ حەڵاڵە کچەکەی مارە بکەن.

٣- شرط (مەرجی)، وەکو پەروەردگار دەفەرموویْت: ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٨٠﴾ ﴾ البقرة: ١٨٠، ڕستەی (إنْ تَرَکَ خَيْراً) لە وەسیەتدا مەرجە.

٤- غایە (مەبەست و سەرئەنجام)، وەکو پەروەردگار دەفەرموویْت: ﴿ وَلَا تَحْلِقُوا۟ رُءُوسَكُمْ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْهَدْىُ مَحِلَّهُۥ ۚ ﴾ البقرة: ١٩٦، یان ئایەتی ﴿ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ۖ ﴾ البقرة: ٢٢٢

٥- (بدل بعض) لەجیاتی (بدل الکل)، وەکو پەروەردگار دەفەرموویْت: ﴿ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۚ ﴾ آل عمران: ٩٧، کە بەدەڵی (الناس)ە عامە، حەجکردنی تایبەتکردووە بەوانەی توانایان هەیە ئەو ئەرکە جێبەجێ بکەن.[1]

دووەم: المخصص المنفصل، موخەصیصی مونفەصیل ئەوەیە لەگەڵ عامەکە نەهاتبێت، بەڵکو لە شوێنێکی تردا بەئایەتێک، یان حەدیسێک، یان ئیجماع، یان قیاس، حوکمە عامەکەی تایبەت کرابێت.

١- حوکمی گشتگیری قورئان، کە بەقورئان تایبەت کرابێت، وەکو پەروەردگار دەفەرموویْت: ﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ۚ ﴾ البقرة: ٢٢٨، ئەم ئایەتە حوکمی گشتی دەگەیەنێت و شمولی هەموو تەڵاق دراوێک دەکات سکپڕ بێت یان

---

١- الدراسات، ل١٢٥٦-١٢٦٢.

سـكپڕ نەبێـت، سـەرجێیی لەگەڵ کرابێ یـان نەکرابێ، دوای ئەم حـوکمە گشـتیە بەم ئایەتە تایبەت کراوە: ﴿ وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّۚ ﴾ الطلاق: ٤

٢- حـوکمی گشـتگیری قورئـان، کە بە فەرمـوودەی پێغەمـبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) تـایبەت کـراوە، وەکـو خـوای پەروەردگـار دەفەرمووێـت: ﴿ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلۡبَيۡعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْۚ ﴾ البقرة: ٢٧٥، ئەم ئایەتە تەخصیص کراوە بەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ)، کە بوخـاری و موسـلیم ڕیوایەتیـان کـردووە لە ئیبنـو عـومەرەوە ڕەزای خـوای لێبێـت، دەفەرمووێـت: پێغەمـبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) (نَهَى عَـنْ بَيْـعِ حَبَـلِ الْحَبَلَـةِ). واتـا: پێغەمـبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) نەهی کـردووە لەو جـۆرە فرۆشـتنەی: کەدەبەسـترێ بەزانینی بەچـکەی ناوسـکی حوشـتری ئاوسـەوە، ئەم جـۆرە مـامەڵەیە لەسەردەمی پێش ئیسلامدا باوبووە.

٤- نمونەی حـوکمی گشـتی کە بەئیجمـاع تەخصیص کرابێت، وەکو خـوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ ﴾ النساء: ١١، بەکـۆڕای زانایـان ئەم حـوکمە کـۆیلە نـاگرێتەوە، چـونکە کـۆیلایەتی مـانیعە لە میراتگرتن.[١]



١- الدراسات، ل ١٢٦٣- ١٢٧٢.

**واتای (القصص):**

القصص:(تتبع الأثر)، واتا: شوێن پێهەڵگرتن، وەکو خوای پەروەدگار دەفەرمووێت: ﴿فَٱرْتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا قَصَصًا ۝٦٤﴾ الکهف: ٦٤، واتا موسا و هاوڕێکەی بەشوێن پێی خۆیاندا گەڕانەوە.

لەڕووی زاراوەییەوە: هەواڵدانە دەربارەی ڕووداوێک بە چەند قۆناغێک، کە یەک لەدوای یەک هاتبێت.[1]

چیرۆکی قورئانی پیرۆز ڕاستترینی چیرۆکەکانە، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثًا ۝٨٧﴾ النساء: ٨٧، وەباشترینی چیرۆکەکانە، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ بِمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ﴾ یوسف: ٣

پەندو ئامۆژگاری بەسودی تێدایە بۆ ئەوکەسانەی کە خاوەنی بیروهۆشن، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿لَقَدْ كَانَ فِى قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ یوسف: ١١١

---

١- ابن العثيمن، أصول التفسير، ل٣٩.

**چیرۆکەکانی قورئانی پیرۆز دەکرێنە سێ جۆر:**[1]

١- چیرۆکی پێغەمبەرانە، لەوانەی کە ڕوویداوە بۆیان، لەگەڵ ئیمانداران و بێباوەڕان، وەکـو چـۆنێتی بـانگەوازی پێغەمـبەران بـۆ گەلەکەیـان و چـۆنێتی باوەڕهێنـان، وە بەرهەڵستی کردنیان لەلایەن بێباوەڕانەوە.

٢- چیرۆکی کەسانێک، یان کۆمەڵەو گرووپێک و گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانیان، کە بۆ ئێمە پەندو ئامۆژگاری تێدایە، وەکو چیرۆکی مەریەم علیه السلام و یاوەرانی ئەشکەوت (الأصحاب الکهف) و ئەصحابی سەبت و ئەصحابی ئوخدودو ئەصحابی فیل و تالوت و جالوت و دوو کوڕەکەی ئادەم علیه السلام....هتد.

٣- ئەو چیرۆکانەی کە لەزەمانی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ڕوویانداوە، وەکو غەزای بەدرو ئوحود، وە ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ ئەبولەهەبی مامی، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ تَبَّتْ يَدَآ أَبِى لَهَبٍ وَتَبَّ ۝١ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ۝٢ سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ۝٣ وَٱمْرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ ۝٤ فِى جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍۭ ۝٥ ﴾ المسد: ١ - ٥

وە هەروەها باسی هۆزی بەنو نەزیرو بەنو قوڕەیزە، وە باسی دوو ڕووەکان و....هتد.

---

١- سەرچاوەی پێشوو، ل٣٩.

**سوودی چیرۆکە قورئانیەکان:**

١- چەسپاندنی پەیامی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، چونکە هەواڵی گەلانی پێشوو هیچ کەس نازانێت جگە لە خوای پەروەردگار: ﴿ تِلْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهَآ إِلَيْكَ ۖ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَآ أَنتَ وَلَا قَوْمُكَ مِن قَبْلِ هَٰذَا ۖ ﴾ هود: ٤٩

٢- دڵنەوایی کردنی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، لەوەی کە لەلایەن بێباوەڕانەوە توشی دەبوو، چونکە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دڵتەنگ دەبوو لەوانەی کە بێباوەڕان دەیانوت و بە درۆیان دادەنا، لە کاتێکدا پێغەمبەری نازدار پێی خۆش بوو هەموو خەڵکی ئیمان بهێنێت، بەڵام لە بەرامبەریشدا لە قەومەکەی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەندێک لە کەسە نزیکەکانی خۆی ئیمانیان پێ نەهێناو سوکایەتیان پێدەکرد، وە بێ گومان پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەمە زۆر دڵتەنگ دەبوو، خوای پەروەدگاریش بە گێڕانەوەی چیرۆکی گەلەکانی پێشوو، دڵنەوایی پێغەمبەر نازداری دەکرد، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَبِٱلزُّبُرِ وَبِٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُنِيرِ ﴿٢٥﴾ ﴾ فاطر: ٢٥

٣- ئاگادارکردنەوەو ترساندنی بێباوەڕان، لەسەر بەردەوام بوونیان لە کوفرو بێباوەڕی، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ ۞ أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ دَمَّرَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ ۖ وَلِلْكَٰفِرِينَ أَمْثَٰلُهَا ﴿١٠﴾ ﴾ محمد: ١٠

٤- ئامۆژگاری كردنی ئیمانداران، چاولێكردنی بڕوادارانی گەلانی پێش خۆیان و، ڕوونكردنەوەی هۆكاری سەركەوتنیان و هۆكاری لە ناوچوونی گەلانی ستەمكارو بێباوەڕ، وەكو خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ فَجَآءُوهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَٱنتَقَمْنَا مِنَ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ ۖ وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾ الروم: ٤٧

٥- ڕوونكردنەوەی دادگەری خوای پەروەردگار بە سزادانی بێباوەڕان، كە پێغەمبەرانیان بەدرۆ دادەنا: ﴿ وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ۖ فَمَآ أَغْنَتْ عَنْهُمْ ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِى يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ لَّمَّا جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ ﴾ هود: ١٠١

٦- تەصدیقكردنی پێغەمبەرانی پێشوو، بەزیندووڕاگرتنی یادو یادەوەریان، بە نەمری هێشتنەوەی ئاسارو ئاكاریان.

٧- ڕوونكردنەوەی حیكمەتی خوای پەروەردگار، كە لە ناو چیرۆكەكاندا هاتووە، وەكو خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّنَ ٱلْأَنۢبَآءِ مَا فِيهِ مُزْدَجَرٌ ﴿٤﴾ حِكْمَةٌۢ بَٰلِغَةٌ ۖ فَمَا تُغْنِ ٱلنُّذُرُ ﴿٥﴾ ﴾ القمر: ٤ - ٥

**سوودو حیكمەتی دووبارەبوونەوەی چیرۆكەكان:**[١]

١- لەبەر گرنگی چیرۆكەكەیە و، گرنگی پێدانیەتی.

٢- تەئكید كردنەوەی چیرۆكەكەیە، بۆ ئەوەی لە دڵی خەڵكی بچەسپێت.

---

١- سەرچاوەی پێشوو، ل٤٠.

٣- ڕەچاوکردنی کات و حاڵی خەڵکی پێکراوە، لەبەر ئەوەیە بەزۆری لەچیرۆکی سورەتە مەککیەکان توندیتی تێدایەو، بە پێچەوانەوە لە چیرۆکی سورەتە مەدەنیەکان نەرموونیانی تێدایە.

٤- ڕاستێتی قورئان دەردەخات، کەبێگومان لەلایەن خوای پەروەردگارەوەیە، چونکە ئەو هەموو چیرۆکە جیاوازانەی تێدایەو هیچیان پێچەوانەی ئەویتریان نیە.

٥- ڕوونکردنەوەی بەلاغەتی قورئانە، تایبەتمەندی بەلاغە لەوەدایە دەربڕینی واتاکەیەتی بەشێوازی جیاجیا، ئاراستەکردنی یەک مانایە لە بەرگ و پۆشاکی جۆراوجۆردا، چیرۆکی دووبارەوەبوو لە قاڵبێکدا داڕێژرابێت لە قاڵبەکەی تر ناچێت، ئەم چیرۆکانە بەشێوەیەک دووبارەکراونەتەوە مرۆڤ لە دووبارە بوونەوەیان جاڕز نابێت، بەڵکوو جار لەدوای جار ئەومانایە لەدڵدا چێژی زیاتر دەبەخشێت.



## ئیسرائیلیات

ئیســرائیلیات: بریتیــیه لەو هەواڵ و زانیاریــانەی کە لایەن بەنــو ئیســڕائیلەوە نەقــڵ کراون، لە یەهود و نەصاراوە، زیاتر لە نەصارا.

ئەو هەواڵ و زانیاریانە کە لە لایەن بەنو ئیسڕائیل نەقڵ کراون، دابەش دەبن بۆ سێ جۆر:

١- ئەوەی کە دینی ئیسلام دانی پێدا ناوە کە حەق و ڕاستە. وەکو: ئیبنو مەسعود خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموێت: (جاء حبر من الأحبار إلى رسول الله (صلى الله عليه وسلم) فقال: يا محمد! إنا نجد أن الله يجعل السماوات على إصبع، والأرضين على إصبع، والشجر على إصبع، والماء على إصبع، والثرى على إصبع، وسائر الخلق على إصبع، فيقول: أنا الملك! فضحك النبي (صلى الله عليه وسلم) حتى بدت نواجذه، تصديقاً لقول الحبر، ثم قرأ: ﴿ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾ الزمر: ٦٧[١]

واتا: زانایەک لە زاناکانی یەهود هات بۆلای پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وتی: ئەی موحەمەد! لای ئێمە هاتووە .لەتەوڕات .، خوای پەروەردگار ئاسمانەکان دەخاتە سەر پەنجەیەکی، زەویەکان دەخاتە سەر پەنجەیەکی، دارەکان دەخاتە سەر پەنجەیەکی، ئــاو دەخــاتە ســەر پەنجەیەکــی، خــۆڵ دەخــاتە ســەر پەنجەیەکــی، وە هەمــوو دروستکراوەکانی تر دەخاتە سەر پەنجەیەکی، وەپاشان دەفەرمووێت: من پادشام ! پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێدەکەنێت و دانی موبارەکی دەردەکەوێت، بۆ

١- بوخاري/ ٤٨١١.

بەڕاست دانانی ووتەی زاناکە، پاشان ئەم ئایەتە دەخوێنێتەوە:﴿ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦ وَٱلۡأَرۡضُ جَمِيعٗا قَبۡضَتُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴾ الزمر: ٦٧

٢- ئەوەی دینی ئیسلام بەدرۆی خستۆتە شایەتی نادروستی بۆداوە، ئەمە وەرگرتنی دروست نیە. وەکو بوخاری ڕیوایەتی کردووە، لە جابرەوە ڕەزای خوای لێبێت، دەفەرمووێت: یەهود دەیان ووت: هەرکەس لە گەڵ خێزانی لە دواوەوە جووت بێت، ئەوە کوڕی دەبێت دوای ئەوە ئەم ئایەتە نازڵبوو: ﴿ نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡۖ ﴾ البقرة: ٢٢٣

٣- ئەوەی دینی ئیسلام، لەسەری بڕیاری درووستی و نادروستی نەداوە، ئەوە پێویستە بووەستین لەسەری.

وەکو بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێبێت، دەفەرمووێت: ئەهلی کیتاب تەوراتیان بە عیبرانی دەخوێند، وە تەفسیریان دەکردەوە بە عەرەبی بۆ ئەهلی ئیسلام، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: نەبەڕاستی دانێن نە بە درۆی بخەنەوە، بڵێن: ﴿ قُلۡ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ ﴾ آل عمران: ٨٤[1]

بەڵام گێڕانەوەی بەم شێوەیە دروستە، لە بەر ئەوەی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرمووێت: ئەوەی لەمنەوە پێتان دەگات بیگەیەنن، ئەگەر تەنها ئایەتێکیش بێت، ئەوەی لە بەنو ئیسرائیلەوە هاتووە بیگەیەنن کێشەیەک نیە، هەرکەس درۆیەک

---

١- بوخاري/ ٧٥٤٢.

به دەمی منەوە هەڵبەستێت بە ئەنقەست، باجێگەیەک بۆ خۆی دیاری بکات لە ئاگردا.[1]

ـ بەڵام لەکاروباری دینی دروست نیە، پرسیان پێبکرێت، ئیمامی ئەحمەد لە جابرەوە دەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: پرسیار لە ئەهلی کتێب مەکەن، ئەوان ڕێنموونیتان ناکەن، بەلاڕێتان دەبەن....)، لەکاتێکیشدا پێویستی نەدەکرد پرسیان پێبکرێت، چونکە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خۆی ڕێنیشاندەریانی دەکرد بە قورئانی پیرۆز، پێویستیان بەهیچی تر نەبوو.



١- بوخاري/ ٣٤٦١.

## ئیعجازی قورئان:

لەڕووی زمانەوانییەوە، ئیعجاز واتا: سەلماندنی بێ دەستەڵاتی.

معجزە: لە (عجز) وەرگیراوە، ناوە بۆ نەتوانینی کردنی شتێک، کە دژەکەی (قدرة)ە واتا: دەسەڵات و توانا، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ وَمَا هُم بِمُعْجِزِينَ ۝٥١ ﴾ الزمر: ٥١، وە ﴿ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ۝١٣٤ ﴾ الأنعام: ١٣٤، واتا: ئێوە هەرگیز لە دەست خوا دەرناچن.[١]

لەزۆر ئایەتی تردا هاتووە.

لەڕووی زاراوەییەوە: موعجیزە: بۆ خۆی کارێکە لەسەرووی ئاستی عادەتەوەیەو بۆ تەحەددا ڕادەنوێنرێ و بەربەرەکانێ ناکرێت،[٢] ئەمە هەندێکجار بەرجەستەیە و هەندێکجار عەقڵیە.

خوای پەروەردگار بۆ هەرگەل و هۆزێک کە پێغەمبەرێکی ناردووە موعجیزەشی پێداوە بۆ ئەوەی دەستەڵاتی خوای گەورەیان بۆ دەرکەوێت و دەستەوەستانیان بکات، پاشانیش هەندێکیان باوەڕیان هێناوەو هەندێکیشیان بێ باوەڕبوون پێی و بە جادوو"سیحر" ناوزەندیان کردووە، ئەو موعجیزەیە هەندێکجار بەرجەستە"حسی" بووەو هەندێکجار عەقڵی بووە، زۆرینەی موعجیزەکانی بەنو ئیسرائیل بەرجەستە"حسی" بوون، لە بەرئەوەی ئەهلی تێفکران نەبوون، بەڵام موعجیزەی ئەم ئوممەتە عەقڵیە، لە بەر ئەوەی ئەهلی تێفکران و تێگەیشتنن، موعجیزەی

---

١- مناع القطان، مباحث في علوم القرآن، ل٢٦٥.

٢- سەرچاوەی پێشوو.

پێغەمبەرانی پێشـوو بە پێی داواکاری قەومەکانیان بووە و، بەتەبیعەتی خەڵکەکەو ئەو چەرخەی کەتێـیدا ژیـاون لەڕووی ئەوەی کە گرنگیـان زیـاتر بە چی داوە، وەکـو قەومی سـاڵح مـوعجیزەکەی بریتی بـوو لە وشـتر، لەبەر ئەوەی گرنگیان زیاتر بەشـوانێتی داوە، مـوعجیزەی موسـا دارەکەی دەسـتی بـووە، لە کـاتی فڕێـدانی ئەبـوو بە مـارێکی گەورە، چـونکە لەسـەردەمی موسا زیـاتر گرنگی بەسیحر دراوە، ئەم جـۆرە موعجیزانە تەنها بـۆ کاتێکی دیاری کراو بووە و، کەسی تر نەیبینیوە، مەگەر ئەوانە نەبێت کە ئامەدەبوونە، یـان تەنهـا ئەوکەسـانە بینـیویانە کە لەو سـەردەمە ژیـابن، بەڵام مـوعجیزەی قـورئـان بەردەوامە تـا ڕۆژی دوایـی، لە ڕووی بەلاغەت و ڕوونـی و ڕێکـی و تەرتیبی ئایەتەکـان و هەواڵـدان لە نادیار "غەیبیات"، کەسێکی تـر ناتوانێت نموونەی ئەو قورئانە بهێنێت و، بگـرە نـاتوانن هاوشـێوەی سـوورەتێکیش بهێـنن ، بێتوانایـیان لەوەدا نـیە کە هەوڵیـان نەدابێـت، بگـرە کەسـی زیـرەک و بەتوانـاو بەلیـغ و شارەزاشـیان تێـدا بـووە، هەمـوو هەوڵێکیشـیان خسـتۆتە گەڕ، بەڵام نەیـان توانیـوە، خـوای پەروەردگاریش لە ڕێـگەی پێغەمـبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، بە چەنـد قۆناغێک تەحەددای عەرەبی کـردووە بە قورئان:

١- تەحەددای کـردن بە هەمـوو قورئـان بە شـێوەیەکی گشـتی، خـوای پەروەردگـار ڕوودەکـاتە هەمـوو خەڵکـی، وە بە جنۆکەشـەوە کە بتـوانن هاوشـێوەی ئەو قورئـانە بهێنن، وەکو خـوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ قُل لَّئِنِ ٱجْتَمَعَتِ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَىٰٓ أَن

﴿ يَأْتُوا۟ بِمِثْلِ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِۦ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ﴿٨٨﴾ ﴾

الإسراء: ٨٨[1]

ئەم تەحەددایە ڕوونە، کە هەموو خەڵکی و جنۆکە ناگرێتەوە، چونکە هەموویان شارەزای زمانی عەرەبی نین، بەڵام ئەگەر هەموو زاناکانیان بە هاوکاری یەکترو بەهێزو گرو تینیانەوە بێن، ناتوانن هاوشێوەی ئەم قورئانە بهێنن.

٢- لە قۆناغی دووەمدا، تەحەددای کردن کە بتوانن (دە) سورەتی هاوشێوەی قورئانی پیرۆز بهێنن: وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا۟ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِۦ مُفْتَرَيَٰتٍ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٣﴾ ﴾ هود: ١٣ واتە: یان دەڵێن هەڵیبەستووە!، بڵێ: ئەگەر ڕاست دەکەن، دەسا ئێوە بەیارمەتی هەرکەسێ دەستان دەکەوێت (جگە لەخوای گەورە)، دە سورەتی هەڵبەستراو وەک ئەمە بهێنن.

٣- لە قۆناغی سێیەم، تەحەددای کردن بتوانن یەك سورەت بهێنن: ﴿ وَإِن كُنتُمْ فِى رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِۦ ﴾ البقرة: ٢٣،[2] واتە: ئەگەر ئێوە گوومانتان لەوە هەیە کە ناردومانە بۆ ئەم بەندەیەمان .کە موحەممەدە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، دەی ئێوە سورەتێك هاوشێوەی بهێنن.

---

١ - سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦٥.

٢- سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦٥.

پاشـان خـوای گەورە باسـی موعجیزەکانی قورئـان دەکات، کە هـیچ کەسـێک ناتوانێـت وەک قورئان بهێنێت، با دە سورەت یان سورەتێکیش بێت، چونکە قسـەی خـوای گەورە لە قسـەی دروسـتکراوەکانی ناچێت، هەر وەکو چۆن خـۆی و سـیفەتەکانی لە سـیفەتی دورستکراوەکانی ناچێت.

هەروەها قورئانی پیرۆز، تەنها لە یەک ڕووەوە موعجیزە نییە، بەڵکو تاک تاکی ئایەتەکان مـوعجیزەیە، لە ڕووی بەلاغەو تەرتیـب و ڕێکـی داڕشـتنی ووشـەکان، نە هەر ئەوەش، هەواڵ و مێژووی قەومەکانی پێشـووی تێـدایە، کە ئەو هەواڵ و زانیاریـانە بەو شـێوەیە هیچ کەسێك نەیگێڕاوەتەوە، هەواڵی غەیبیاتی تێدایە و، ئیعجـازی مێژوویی و کەونی و زمانەوانی و زانستی و شەرعی و....هتد تێدایە، ئەمەش هەندێک لەو ئیعجازانە:

١- ئیعجـازی (اللغـوي) زمـانەوانی: خـوای پەروەردگار قـورئـانی پیرۆزی دەبەزانـدووە، وە تەحەددای عەرەبی پێکـردووە کە هاوشـێوەی ئەم قـورئـانە بهێـنن، یـان دە سـورەت، یـان سورەتێک، لە کاتێکدا ئەم قورئانە هەر بەو پیتانە نوسراوە کە عەرەب بە کاری هێناوە، بەڵام ئەمە لە هەمـوو شـتێک لایـان قورسـتربوو، بە هەمـوو شـێوەیەک ڕووبەڕووی پێغەمبەری نـازدار دەبـوونەوە وئازاریـان دەدا، پێـیان دەووت: شـێتە، سـاحرە، دوایـش سەیریان دەکرد ئەمە لە قسـەی شێت ناچێت، چونکە شێت قسـەی وا ناکات و، ئەمە لە کاری ساحیر ناچێت، بەردەوام لە هەوڵـدا بـوون بۆ ئەوەی ئەو تەحەددایە بشکێنن، بەڵام بێگومـان نـاتوانن، چـونکە جیـاوازە لەگەڵ ئەو زمانەی ئەوان بەکاری دەهێنن، لە ڕووی شـێوازی پێکهـاتەی وشـەکانی و ناسکی و شـیرینی و ئوسـلوب و شـێوازی و زەنگ و ئاوازی و ڕەچاوی پێداویستی بارودۆخ لە جۆرەکانی دەربڕیندا، بە ڕستەی ناوی و ڕستەی کـرداری و نەرێ و سـەلماندن و ناسـراو و نەناسـراو، پێشخسـتن و دواخسـتن و گشـتی و

تـايبەت و مـوتلەق و مـوقەيەد... هتـد، ئەمەش چەنـد نمـونەيەكى ئيعجـازى زمـانەوانى و ڕەوانبێژى:

- خـواى پەروەردگار لەسـەر زارى سـەييدنا ئيبراهيم دەفەرموويْت: ﴿ ٱلَّذِى خَلَقَنِى فَهُوَ يَهْدِينِ ۝٧٨ وَٱلَّذِى هُوَ يُطْعِمُنِى وَيَسْقِينِ ۝٧٩ هُوَ يُطْعِمُنِى وَيَسْقِينِ ۝ وَٱلَّذِى يُمِيتُنِى ثُمَّ يُحْيِينِ ۝٨١ ﴾ الشـعراء: ٧٨ – ٨١، (هـو)ى بەكارهێنـاوە لەگەڵ (فَهُوَ يَهْدِينِ) وە (هُوَ يُطْعِمُنِى وَيَسْقِينِ) وە (هُوَ يُطْعِمُنِى وَيَسْقِينِ)، چـونكە بـۆ جەخـت كـردنەوەيە لەوەى كە خـواى پەروەردگار ڕێنمـوونى كارەو ڕۆزى دەرو شـيفابەخشـە، چـونكە هەندێـك كەس پێيـان وايە كە بەدەسـت كەسـانى تـرە، بەڵام لە بـۆ مرانـدن و زينـدوو كـردنەوە، (هـو)ى بەكار نەهێناوە، چـونكە هەمـوو كەس گوومانى لەوەدا نيە كە مردن و زينـدووكردنەوە، لە تواناى هيچ كەسێكدا نيە جگە لە خواى پەروەردگار.

- خـواى پەروەردگار وێناى حـاڵى كافرو بێباوەڕانمان بـۆ دەگێڕێتەوە، ئەو كاتەى دەخـرێنە ئـاگرى دۆزەخەوە دەفەرموويْـت: ﴿وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًا حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا فُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا ﴾ الزمـر: ٧١، ئەو كاتـانەى كە بێبـاوەڕان دەبـرێنە سـەر دەرگاى دۆزەخ، خـواى پەروەردگار دەفەرموويْـت: (فُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا) بە شـێوەيەكى كتـوپڕ دەرگاى دۆزەخيـان لێـدەكرێتەوەو دەخـرێنە نـاوى، بەڵام لە وێنـاو حـاڵى ئيمانـداران، ئەوكاتـانەى دەڕۆنە نـاو بەهەشـت دەفەرموويْـت: ﴿ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ رَبَّهُمْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ زُمَرًا حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا ﴾ الزمـر: ٧٣، بـۆ ئەو كاتـانەى ئيمانـداران دەبـرێن

بەرەو بەهەشـت (وَفُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا)، لێرەدا (واو)ی حـاڵی بەکار هـاتووەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە بە بەردەوامی دەرگاکانی بەهەشـت کراوەیە، ئیمانداران هەر لەدوورەوە هەست بە بۆن وخۆشیەکەی دەکەن، بەڵام دەرگای دۆزەخ داخراوە بەسەریاندا، وەکو خـوای پەروەدگار دەفەرمووێت ﴿ عَلَيۡهِمۡ نَارٞ مُّؤۡصَدَةُۢ ﴿٢٠﴾ ﴾ البـــــلد: ٢٠، بەشـێوەیەکی لەناکـاو و کتــوپڕ بەســەریان دەکــرێتەوەو دەکەونە نــاویەوە، کە ئەوەش بــۆ زێــدە ترساندنیانە، خوای پەروەردگار پەنامان بدات.

٢- ئیعجازی غەیبی(نادیار):

ـ یەکێکی تـر لە ئیعجازەکانی قورئـان هەواڵە غەیـبییەکانە، ئەم هەواڵانە هەنـدێکی لە زەمـانی ڕابـردوو بـووە، وەکـو خـوای پەروەردگار دەفەرمووێـت: ﴿ ذَٰلِكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ نُوحِيهِ إِلَيۡكَۚ وَمَا كُنتَ لَدَيۡهِمۡ إِذۡ يُلۡقُونَ أَقۡلَٰمَهُمۡ أَيُّهُمۡ يَكۡفُلُ مَرۡيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيۡهِمۡ إِذۡ يَخۡتَصِمُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ آل عمران: ٤٤ واتە: تۆ ئەی موحەممەد، ئەمە لەو دەنگ و باسـەیە کە تۆ ئاگات لێیان نەبووەو ئێمە دەیخەینە دڵتەوە، هەروەها تۆ لەوێ نەبووی کە قەڵەمیان تـووڕ هەڵـدەدا، کێ سـەرپەرشتی مەریەم بێ، ئەو کاتەش لە ناو خۆیانـدا کێشـەیان کرد، تۆ لەناویاندا نەبووی.

. هەروەها هەندێکی پەیوەندی بووە بە سـەردەمی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، لەکاتی ڕوودانی، خـوای پەروەردگار پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)ی لە ڕووداوەکە ئاگادار کردۆتەوە، وەک ئاشکراکردنی پیلانی دووڕووەکان بەرامبەر بە موسـوڵمانان، کاتێك کە موسـوڵمانان چووبوونە دەرەوەی مەدینە بۆ جیهاد، دووڕووەکان کە لە ناو

مەدینە مابوونەوە، مزگەوتێکیان دروست کرد، بۆ ئەوەی تەفرەقەو جیاوازی بخەنە ناو موسوڵمانان و هەموو موسوڵمانان لەتەنها یەک مزگەوتدا کۆنەبنەوە، بەڵام خوای پەروەردگار، هەر زوو پێغەمبەری لەو پیلانە ئاگادارکردەوە، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسْجِدًا ضِرَارًا وَكُفْرًا وَتَفْرِيقًۢا بَيْنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَإِرْصَادًا لِّمَنْ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن قَبْلُ ۚ وَلَيَحْلِفُنَّ إِنْ أَرَدْنَآ إِلَّا ٱلْحُسْنَىٰ ۖ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَـٰذِبُونَ ﴿١٠٧﴾ لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا ۚ لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ ۚ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْ ۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُطَّهِّرِينَ ﴿١٠٨﴾ أَفَمَنْ أَسَّسَ بُنْيَـٰنَهُۥ عَلَىٰ تَقْوَىٰ مِنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٍ خَيْرٌ أَم مَّنْ أَسَّسَ بُنْيَـٰنَهُۥ عَلَىٰ شَفَا جُرُفٍ هَارٍ فَٱنْهَارَ بِهِۦ فِى نَارِ جَهَنَّمَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٠٩﴾ لَا يَزَالُ بُنْيَـٰنُهُمُ ٱلَّذِى بَنَوْاْ رِيبَةً فِى قُلُوبِهِمْ إِلَّآ أَن تَقَطَّعَ قُلُوبُهُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١١٠﴾ ﴾ التوبة: ١٠٧ - ١١٠

ئەوانەش کە مزگەوتێکیان دروست کردووە، تا بیکەنە هۆی زیان و خوا نەناسی و جیاوازی خستنە نێوان خاوەن باوەڕان و تا ڕوانگەش بێت بۆ ئەوانەی لە پێشوودا دژی خوداو پێغەمبەرەکەی ڕاوەستابوون.

. هەروەها هەندێ لەو غەیبیاتانەی کە ڕوویان نەدابوو خوای پەروەردگار پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)ی، لە ڕێگەی قورئانی پیرۆز ئاگادارکردەوە کە لە داهاتوودا ڕوودەدەن، هەر لەسەردەمی پێغەمبەری خودا ڕوویاندا، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ﴿٢﴾ فِىٓ أَدْنَى ٱلْأَرْضِ وَهُم مِّنۢ بَعْدِ غَلَبِهِمْ

سَيَغۡلِبُونَ ﴿٣﴾ فِي بِضۡعِ سِنِينَۗ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ مِن قَبۡلُ وَمِنۢ بَعۡدُۚ وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿٤﴾ بِنَصۡرِ ٱللَّهِۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥﴾ وَعۡدَ ٱللَّهِۖ لَا يُخۡلِفُ ٱللَّهُ وَعۡدَهُۥ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٦﴾﴾ الروم: ٢ – ٦ واته: ڕۆمەكان لە نزیكترین یاخود نزمترین شوێنی زەویدا تێك شكان و ئەوان دوای تێكشكانەكەیان هەر سەردەكەون، لەماوەی چەند ساڵێكی تردا، فەرمان هەر بۆ خوای گەورەیە لەوەو پێش و لەوە و دواش، ئەو ڕۆژەی موسوڵمانان بە سەركەوتنی خوا دڵخۆش دەبن و، خوا بیەوێت هەر كەس سەربخات سەری دەخات، هەر خۆی شكۆمەندو میهرەبانە، خوا بەڵێنی داوەو بەڵێنی خواش دوا ناكەوێت، بەڵام زۆربەی خەڵكی نازانن.

ئەوە بوو دوای كەمتر لە (١٢)ساڵ ڕۆمەكان سەركەوتن بەسەر فارسەكان، ئەو هەواڵەش كە خوای پەروەردگار دابووی بە پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هاتە دی.

ئیعجازی زانستی: قورئانی پیرۆز ئاماژەی بە زۆر زانست و زانیاری كردووە، ئەو زانیاریانەی كە لە قورئان باس كراوە، هەندێكی لە ئێستادا زاناكان لە دوای هەوڵ و ماندووبونێكی زۆر پێی دەگەن، كەچی بەر لە هەزارو چوارسەد ساڵ پێش ئێستا لە ڕێگەی وەحیەوە خوای پەروەردگار بە پێغەمبەری گەیاندووە.

هەروەها لە ئێستادا كتێب لە بواری ئیعجازی قوڕئان نوسراوەتەوە، دیارترینیان كتێبی (مۆریس بۆكای)، لەگەڵ (زغلول النجار)، كە كۆمەڵە ئیعجازێكی زانستی لە خۆ گرتووە لە بوارەكانە كەونی و مێژوی و زانستی و.....هتد.

ئیستاش چەند نموونەیەک لە ئیعجازی زانستی ئەهێنینەوە:

ـ موتـــوربەکردنی ڕووەک، دوو جـــۆر موتوربەکردنمـــان هەیە، یەکێکیـــان نێـرەکەو مێـینەکەی لە یەک گوڵـدا هەیەو ئەمەیـان موتـوربە کـردنەکەی زاتیـیە و، هەنـدێکی نێـرەکەی لە گوڵێکـدایەو مێـینەکەی لە گـوڵێکی تـر، ئەمەیـان پێویســت دەکـات بگـوازرێتەوە بـۆ ئەوەی بپیتێنرێن، ئەمەش بەڕێـگەی دەسـت دەبێـت یـان بەهـۆی بـاوە دەبێـت، وەک داری خورمـا، خـوای پەروەردگار دەربـارەی ئەم کـردارە دەفەرمووێـت: ﴿ وَأَرۡسَلۡنَا ٱلرِّيَٰحَ لَوَٰقِحَ ﴾ الحجر: ٢٢

- ئیعجازێک دەربارەی ڕێژەی ئۆکسجین، ڕێژەی ئۆکسجین لە سـەر زەوی ٢١ %، تاوەکو زیـاتر لەســەر ڕووی زەوی بەرزبیــتەوە، ڕێــژەی ئۆکســجین کەم دەکـات و، لەبەرزی (٦٧)میل، ڕێژەی ئۆکسجین نامێنێت، پەسـتانی هەواش کەم دەکات، ئەگەر کەسێک بەرەو بۆشـایی ئاسـمان بەرز بکـرێتەوە، بە هـۆی کەمـی ئۆکسـجین سیـیەکانی گـرژ دەبێتەوە و، ئەو پەردە ناو پۆشـەی کە لە ناو سکدایە پەستان دەخاتە سـەر سیەکان، مرۆڤ هەست بە سینە توندی دەکات، خـوای پەروەردگاریش دەفەرمووێت: ﴿ وَمَن يُرِدۡ أَن يُضِلَّهُۥ يَجۡعَلۡ صَدۡرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجٗا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي ٱلسَّمَآءِۚ ﴾ الأنعـــام: ١٢٥، واتـا: خـوای گەورە بیەوێت کەسێک گومڕا بکـات، هێنـدە نەفەس تەنگی دەکات، وەک بەرەو ئاسمان سەرکەوێت وایە.

ئیعجـازی تەشـریعی: ئاشـکرایە مرۆڤـایەتی بەدرێژایی مێژوو، جیـاوازبوونە لە ڕووی شـکڵ و شـێوازو بیرکردنەوەیـان و، لە یاسـاو ورێسـاو دابوونەریتـدا، ئامـانج لەمەش ئەوە بـووە هەریەکەیـان خۆشـبەختی دەسـتەبەر بکەن، بـۆ تـاکو کۆمەڵگەکەیان، بەڵام هـیچ کام لەمانە نەگەیشـتوون بەوەی ڕیسـاو یاسـایەکی وا دابنێن هاوشـێوەی قورئان، یان کەمتر

یـان نزیـک بێـت لە قورئـانی پیـرۆز. خـوای پەروەردگـار بـۆ هەر گەل و هۆزێـک کە پێغەمبەرێکی ڕەوانە کردبێـت، یاسـاو مەنهەجێکـی بـۆ ڕەوانە کـردووە، بـۆ ئەوەی لە سـەری بڕۆن و گـومڕاو سەرلێشـێواو نەبـن، وەکـو خـوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ﴾ المائدة: ٤٨.

قورئانی پیرۆز، بـۆ ئەوە هـاتووە بـۆ ئەوەی بیروبـاوەڕێکی وا لەدڵی خەڵکی بچەسپێنێت، کە کـاردانەوە لە سـەر ئاکـارو ڕەوشـتیان دروسـت بکـات، وە کـاردانەوەی لەسـەر هەڵسـوکەوتی ڕۆژانەیـان هەبێـت، کە ئەمە لەهـیچ یاسـایەکی دەسـتکردا نیـیە، چـونکە ئەو یاسا دەستکردانە لەسـەر بنەمای عەقیـدە بونیاد نەنراون، بەڵام یاسـاو تەشـریعی ئیسلام، لەسەر بنەمای یەکتاپەرستی و چاودێری خوایی دامەزراوە.

بنەماکانی یەکتاپەرستی کە لە قورئانی پیرۆز هاتبێت، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ۝١ اللَّهُ الصَّمَدُ ۝٢ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ۝٣ وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ ۝٤ ﴾ الإخلاص: ١ – ٤،

، ﴿ هُوَ الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ۝٣ ﴾ الحديد: ٣

، ﴿ ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ ﴾ يونس: ٣

،: ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ ۖ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ ۝١١ ﴾ الشورى: ١١

،: ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الْأَبْصَارَ ۖ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ ۝١٠٣ ﴾ الأنعام: ١٠٣

، وە: ﴿ كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ ۚ لَهُ الْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ۝٨٨ ﴾ القصص: ٨٨

ئەمە ئەو ئایەتـانەیە کە تـاکی موسـوڵمان لەسـەری پەروەردە دەبێـت و گۆڕانکـاری لە ناخیانـدا دروسـت دەکـات، دەبێـتە هـۆی ئەوەی کە پابەنـدبێت بە شـەریعەتی ئیسـلامەکەوە، بەهەمـوو شـێوەیەک، نەفـس ئامـادە دەکـات بـۆ خواپەرسـتی و، ئەو ئەرکانەی کە خـوای پەروەردگار پێی دەسپێرێت، لە وانەی کە خـوای پەروەردگار ئەمری پێکردووە کە بیکات، ئەوەی نەهی لێکردوە دەستی لێ هەڵگرێت.

بەوشێوەیە ئەگەر بیروباوەڕ لەسەر بنەمایەکی ڕاست و دروست سەرچاوەی گرت، ئەو کات یاساو ڕێساکە لەسەر بنەمای عەقیدەکە وەردەگیرێت، ئەگەر بەندەکان هەستان بە ئەنجامـدانی واجیبتاکانیـان، وەکـو نـوێژو ڕۆژوو و زەکـات و حەجی مـاڵی خـوا... ڕەنگدانەوەشی لە سـەر ئاسـتی تـاك و کۆمەڵگا دەبێـت، چـونکە نـوێژ: پەروەردەیەکی ڕۆحییە تـاک فێری هەڵسـوکەوتی جـوان دەکات لەنـاو کۆمەڵـدا، لەشـەو و ڕۆژێکدا پێنج جار نوێژ دەکرێت، ئەم نوێژە دەبێتە ڕێگر لە بەردەم گوناح و تاوان.

زەکات: دەبێتە ڕێگر لەبەردەم چاوچنۆکی و دونیا ویستی، دەبێتە هۆکاری چاکسـازی لە کۆمەڵگەدا و، دەبێـتە هاوکاری لە نێـوان تاکەکانی کـۆمەڵگە، ئەو کات نەفسی مـرۆڤ هەست بە تەواوی و کامڵ بوون دەکات لەگەڵ کەسانی تر.

ڕۆژووگـرتن: زینـدانی کردنی نەفسـە لە هەواو ئـارەزوو، بەهێزکردنی ویسـت و ئیرادەیە، ڕووالەتێکی کۆمەڵکـاریە، کە بەدرێژایـی مانگێـک هەمـوو موسـوڵمانان لەسـەر یەك سیسـتەم کۆبـوونەتەوە، لە خـواردن و خـواردنەوەو خـودا پەرسـتی. ئەمەش فێری یەك دەستەییان دەکات.

هەروەها قورئانی پیرۆز تاکەکانی خێزان لەسەر ڕێزو خۆشەویستی بونیاد دەنێت، وەکو خـوای پەروەردگـار دەفەرمووێـت: ﴿ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا

لِّتَسۡكُنُوٓاْ إِلَيۡهَا وَجَعَلَ بَيۡنَكُم مَّوَدَّةٗ وَرَحۡمَةًۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ۝٢١ ﴾ الروم: ٢١

ژیان و هەڵسوکەوتی ناو خێزان، لەسەر ڕێزو خۆشەویستی دادەمەزرێت، پیاویش کراوە بە چاودێر بەسەریانەوە، واتە ئەرك و بەڕێوەبردنی پێ سپێردراوە.

هەروەها سیستەمی ئەو فەرمانەی کە کاروبارو بەرنامەی کۆمەڵگە بەڕێوە دەبات، بەشێوەی شورا- پرس و ڕاوێژە-، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿ وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ ﴾ الشوری: ٣٨، وە ئەگەر حوکم بە ڕاوێژو یەکسانی و دادگەری بێت، لە کاروباری وڵات، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلۡقِسۡطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ أَوِ ٱلۡوَٰلِدَيۡنِ وَٱلۡأَقۡرَبِينَۚ إِن يَكُنۡ غَنِيًّا أَوۡ فَقِيرٗا فَٱللَّهُ أَوۡلَىٰ بِهِمَاۖ فَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلۡهَوَىٰٓ أَن تَعۡدِلُواْۚ وَإِن تَلۡوُۥٓاْ أَوۡ تُعۡرِضُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ۝١٣٥ ﴾ النساء: ١٣٥، خوای پەروەردگار فەرمان بە باوەڕداران دەکات، بەیەکسانی و بێ جیاوازی بەکاری خەڵکی ڕابگەن، بۆ خوا شایەتی بدەن، هەرچەندە شایەتی دانەکە بەزیانی خۆتان بێت، یا ئەو شایەتیدانە بەزیانی دایك و باوك و کەسوکاری نزیکتانیش بێت، ئەگەر شایەتی بۆ دراوان دەوڵەمەند بن یا هەژار بن، ئەوا خودا بۆ ئەوان دڵسۆزترە، مەکەونە شوێنی هەواو ئارەزووتان، ئەگەر زمان بگۆڕن، یان خۆتان لە شایەتیدانەکە بدزنەوە، لە هەر کارێك کە ئێوە دەیکەن،خودا هەمیشە ئاگادارە.

خـوای پەروەردگـار دەفەرمووێـت: ﴿ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ۞ ﴾ النسـاء: ٥٨، خـوای پەروەردگار فەرمان دەکات بە بـڕواداران، کە ڕاسپاردەکان بگەیەنن بە دەستی خاوەنەکانیان و، ئەگەر داوەریان کرد با دادگەر بن، خـودا زۆر بـاش و بە باشـترین شـت ئامۆژگاریتـان دەکـات، خـودا هەمـوو شـتێك دەبیستێت، هەموو شتێك دەبینێت.

تەشریعی ئیسلام هاتووە، تەشـریعێکە لە پێناو بەرژەوەندی گشتی هاتووە، تەشریعێکە لە گەڵ خواسـت و پێداویسـتیەکانی مرۆڤەکان دەگونجێت، لە هەمـوو سـەردەمێکدا، تەشـریعێکی ڕێك و تەواوە و، خواستی ڕۆح و دواکاری جەستەی تێدا کۆدەبێتەوە.

قورئـانی پیـرۆز هـاتووە، کـۆمەڵە بنمـایەکی تەشـریعی جیـاوازی لە خۆگرتـووە، وەکـو کـۆمەڵایەتی و ئـابووری و سیاسـی و دەوڵەتـداری و...، بەشـێوەکی ئاسـان و ڕوون و چەسـپاو قەتعی هـاتووە و، ڕەچـاوی کـات و سـەردەم و پێداویسـتیەکانی مرۆڤی تێـدا کراوە.

قورئـانی پیرۆز لە ڕووی تەشـریعەوە مـوعجیزەیە، چـونکە خـاوەنی ئەم سـیفاتانەیە کە لەیاسا دەستکردەکان نیە، کە ئەمانن:

١- تەشـریعی ئیسـلام لەلایەن خـوای پەروەردگـارەوەیە: یەکـێکە لە خـاڵە گرنگەکـانی جیاوازی نێوان تەشریعی ئیسلامی و یاسا دەستکردەکان، چونکە هەر شتێك لەلایەن خـوای پەروەردگارەوە بێت پارێزراوە لە هەمـوو کەموکوڕییەك، خـوای پەروەردگار خـۆی دروسـتکەری ئەم گەردوونەیە، هەرخـۆی زانـایە بە کاروبـاری گەردوون، تەنهـا خـۆی

شـايەنی یاسـا دانـانە، بەڵام یاسـا دەسـتکردەکان لەگەڵ تەشـریعی ئیسـلامی پێـوانەو بەراورد ناکرێـــت، چـــونکە دوو شـــتی لە یەك جـــوودان، چـــونکە خـــودای مەزن دروسـتکارەو، مرۆڤەکان دروسـتکراون، مرۆڤەکان بەپێی کات و شـوێن و بـارودۆخەوە، یـان هەواو ئـارەزوو، توشـی کەم وکـوڕی و لەبیرچـوونەوەو هەڵە دەبـن، تەنهـا خـوای پەروەردگارە پاك و بێگەردەو دوورە لە هەموو کەم و کوڕیەك، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ أَلَا يَعۡلَمُ مَنۡ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ ١٤ ﴾ الملك: ١٤.

٢- گشـتییەو بـۆ هەمـوو جیهـانە: تەشـریعی ئیسـلام بـۆ هەمـوو مرۆڤـایەتی هـاتووە، بـۆ هەموو کات و شـوێنێک، وە نەهـاتووە تەنها بـۆ هۆزێک یا شـوێنێک یـان وڵاتێک یان بـۆ ئـومەتێکی دیـاری کـراو، خـوای پەروەردگار نـاردوویەتی بـۆ هەمـوو جیهـان، وەکـو خـوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةٗ لِّلنَّاسِ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا ﴾ سـبأ: ٢٨

٣- تەشـریعی ئیسـلام گشـتگیرە: تەشـریعی ئیسـلام هەمـوو لایەنەکانی ژیـان دەگـرێتەوە، لایەنی عـەقیدەو بیروباوەڕو پەرستن و ڕەوشت و هەڵسـوکەوت و کۆمەڵایەتی و ئابووری وسیاسـەت و موعـامەلات، وەکـو خـوای پەروەردگـار دەفەرمووێـت: ﴿ وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ تِبۡيَٰنٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ ﴾ النحل: ٨٩.

٤- تەشـریعی ئیسـلامی دادگەری و ئاسانکاریـیە: خـوای پەروەردگار داوای کارێك ناکات کە لە توانـای مرۆڤەکان بەدەربێـت، هەمـوو داواکاریەکانی خـوای پەروەردگار ئاسـانەو هـیچ بـارگرانیەکی تێـدا نـیەو هەمـووی لەسـنوری تواناکـانی مـرۆڤ دایە، وەکـو خـوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖ ﴾ الحـــج: ٧٨،

شـەریعەتی ئیسـلام مـۆڵەت بەو کەسـانە دەدات کە کارێـک لە توانایـان نەبێـت لەکاتی پێویستی و نارەحەتیدا وە سەفەرو نەخۆشی و....

ئەمەش ئەو تایـــبەتمەندیانە بـــوو کە لە شـــەریعەتی ئیســـلامدا هەبـــوون، ئەم تایبەتمەنـدیانە ئیعجـازی تەشـریعی قـورئـان دەسـەلمێنن، شـەریعەتی ئیسـلام تـا ڕۆژی دوایی پارێزراوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت لەلایەن خوای زەوی و ئاسمانەکانەوەیە.



## ڕێگای ناسینەوەی سوڕەتەکان

پێناسەی (سورة) وە (الآية) لەڕووی زمانەوانی و زاراوەییەوە:

(سورة): تەبەری ڕەحمەتی خوای لێبێت دەڵێت: ناوە بۆ هەموو سورەتێك لە سورەتەکانی قورئان، (سورة) جەمعەکەی (سور)ەیە.

(سورة) بەبێ هەمزە واتا (الحائط) پەرژین، هەر بۆیە پێی دەوترێت پەرژین، چونکە سورەت کۆمەڵە ئایەتێکی لە خۆگرتووە، هەروەکو خانوویەک چۆن بە پەرژینێک دەورە دراوە.

(سورة) لەڕووی زاراوەییدا: بریتییە لە کۆمەڵە ئایەتێکی سەربەخۆ، کە خاوەنی سەرەتاو کۆتاییەکن.

(الآية) لە ڕووی زمانەوانییەوە بەچەند واتایەک دێت:

١- المعجزة: وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ سَلْ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ كَمْ ءَاتَيْنَٰهُم مِّنْ ءَايَةٍۭ بَيِّنَةٍ﴾ البقرة: ٢١١

٢- نیشانە: وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ءَايَةَ مُلْكِهِۦٓ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلتَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ ﴾ البقرة: ٢٤٨

٣- پەندوەرگرتن: وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٤٨﴾ ﴾ البقرة: ٢٤٨

٤- بەڵگەو دەلیل: وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ الروم: ٢٢

٥- کۆمەڵەیەك: وەکو عەرەب دەڵێت: خرج القوم بآيتهم، واتا: لە گەڵ کۆمەڵەکەی.

(الآية) لەڕووی زاراوەییەوە:

کۆمەڵەیەکن خاوەنی سەرەتاو کۆتایەکن، ئایەت ئەو جوملانەیە لە قورئانی پیرۆز، کە دابەش بوونە بەسەر سورەتەکان.

**ژمارەی سورەتەکان:**

زەرکەشی دەڵێت: ژمارەی سورەتەکانی قورئان بە ئیتیفاقی ئەهلی (الحل و العقد) سەدو چواردە سورەتە، وەکو لە موصحەفی عوسمانیدا هاتووە، کە سەرەتاکەی (الفاتحة) کۆتاکەیشی (الناس)ە.

هەندێک دەڵێن: سەدو سیازدە سوڕەتە، چونکە سورەتی (الأنفال _ براءة) ووتویانە یەك سورەتە.

لەئەبی رجاء وە دەڵێت: پرسیاریان کرد لە حەسەن دەربارەی (الأنفال - براءة): ووتیان دوو سورەتە یان سورەتێکە؟ ووتی: دووانە.

لە موصحەفی ئیبنو مەسعود سەدو دوانزە سورەتە،چونکە مەعوزەتەینی تێدا نەنووسیوە.

ژمارەی ئایەتەکان: کۆڕای زانایان لەسەرئەوەن، کە شەش هەزار دوسەد ئایەتە، بەڵام ڕاجیاییان هەیە لە سەر زیادەکەی، بەم شێوەیە:

. هەندێك پێیان وایەوە لەوە زیاتر نیە.

. هەندێکی تر دەڵێن: دوسەد و چوار.

. هەندێکی تر دەڵێن: چواردە.

. هەندێکی تر دەڵێن: حەڤدە.

- هەندێکی تر دەڵێن: نۆزدە.

- هەندێکی تر دەلێن:بیست.

- هەندێکی تر دەڵێن: سی و شەش،.....هتد.

هۆکاری ئەم ڕاجیاییەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە،پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە سەری ئایەتەکان دەوەستا بۆ ئەوەی هاوەڵان فێر بکات کە ئەمە کۆتایی ئایەتەکەیە، هەندێکجار نەوەستاوە لەسەری ئایەتێك، ئایەتێکی تریشی لەگەڵی خوێندووەتەوە، بۆ تەواوێتی واتاکەی، هەندێک هاوەڵانیش کە یەکەم جاریان بووە بەو شێوەیە گوێی لێبێت وایزانیوە یەك ئایەتە.

بەڵام ئەمە نابێتە کێشە، چونکە قورئانی پیرۆز پارێزراوە لە هەموو زیاد و کەمییەك، وەك ئەوە وایە پارچە قوماشێك هەبێت دووکەس هەبن بە باڵیان بیپێون، یەکێکیان باڵی درێژ بێت و ئەویتر کورتتر بێت، ئەوکات پێواناکە جیاوازی تێ دەکەوێت، لێرەدا هۆکارەکە لە پێوانە گیریەکەیە قوماشەکەش نەزیادی کردوە نەکەم.

**ناوی سوورەتەکان:**

دابەشبوونی سوورەتەکانی لەڕووی ئەوەی هەندێك لە سوورەتەکان چەند ناوێکی هەیە، دابەش دەبن بۆ سێ بەش:

١- ئەوەی تەنها یەك ناوی هەیە، ئەمەش زۆرینەی سوورەتەکان پێك دەهێنن، وەکو: (النساء، الأعراف، الأنعام، مريم)، وە جگە لەمانەش.

٢- ئەوانەی لە یەك ناو زیاتریان هەیە، وەک سوورەتی (محمد) دوو ناوی هەیە و، پێشی دەوترێت: (القتال)، سورەتی (الجاثية) پێشی دەوترێت: (الشريعة)، سورەتی (النحل) پێشی دەوترێت: (النعم).

هەیە سێ ناوی هەیە، وەکو: (المائدة) پێی دەوترێت: (العقود) وە (المنقطة)، سورەتی (غافر) پێشی دوترێت: (الطول) (المؤمن).

هەیە لە سێ ناو زیاتری هەیە، وەکو سورەتی: (التوبة) ناوەکانی تری: (براءة، الفاضحة، الحافرة)، سورەتی (الفاتحة) وەکو سیوتی ڕەحمەتی خوای لێبێت دەڵێت: پازدە ناوی هەیە لەوانە: (أم الكتاب، أم القران، السبع المثانی، الصلاة، الحمد، الوافية، الكنز، الشافية، الكافية، الأساس).

٣- بەکۆی چەند سورەتێك یەك ناوی لێ نراوە، وەکو: (البقرة، ال عمران) پێیان وتراوە: (الزهراوين)، بە سورەتی: (الناس  . الفلق) وتراوە (الموعذتين)، ئەوانەی کە بە (حم) دەستی پێکردووە وتراوە: (الحواميم).

**سەرچاوەی ناوەکانی قورئان:**

زانایان ڕاجیاییان هەیە لەسەری، دەبن بە دوو کۆمەڵەوە:

١- هەندێک پێی وایە ئیجتیهادییە، وەکو زەرکەشی.

٢- هەندێکی تر پێی وایە تەوقیفییە، بە پێی فەرموودەو قەولی هاوەڵان چەسپاوە، ئەمەش بۆچوونی سیوتییە، کە ئەم بۆچوونەش پەسەندە.

**تەرتیب و ڕێکخستنی سورەتەکان:**

سیوتی دەڵێت: کۆڕاو دەقەکان هاوڕان لەسەر ئەوەی ڕێکخستنی ئایەتەکان تەوقیفییە، سیوتی قەولی زەرکەشی و ئەبو جەعفەر کوڕی زوبێر نەقڵ دەکات دەڵێت: ڕێکخستنی ئایەتەکان لە سورەتەکاندا تەوقیفییەو بە فەرمانی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بووە، ئەمەش ڕاجیایی تێدانیە لە نێوان موسوڵمانن.

وەزانایان ئەم دەقانە بە بەڵگەو دەلیل دەهێننەوە:

لە زیدی کوڕی سابیت ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت: (کنا عند النبي صلى الله عليه وسلم نؤلِّف القرآن من الرّقاع)، واتا: ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قورئانمان لەسەر پێستە دەنوسیەوە.

لە ئیمامی عوسمانەوە ڕیوایەت کراوە، دەڵێت: (وكان إذا نزل عليه (على الرسول) شيء دعا بعض من كان يكتبه، فقال: ضعوا هذه الآيات في السورة التي يذكر فيها كذا وكذا)،

واتا: ئەگەر ئایەتێك بۆ پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نازڵ ببوایە، بانگی یەکێك لەوانەی دەکرد کە دەیاننوسیەوە، دەی فەرموو: ئەم ئایەتە لەو سورەتە دابنێن، کە باس لەوەو لەوە دەکات.

بەم شێوەیە بە فەرمانی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نووسراوەتەوە، هەر بۆیە ڕاجیایی لە ڕێکخستنی ئایەتەکاندا نیە.

ئەبو بەکری باقلانی دەڵێت: ئەو موسحەفەی کە ئێستا بەردەستە کە موسحەفی عوسمانە، هیچ شتێکی لێ کەم نەکراوە، وە هیچ شتێکی بۆ زیاد نەکراوە، ڕێکخستنی و نەزمی سابیت بووە بەو شێوەی کە خوای پەروەردگار نەزم و سابیتی ئایەت و سورەتەکانی کردووە بۆ پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، پێش خراوێک لەوانە دوانەخراوە، وە دواخراوێک لەوانە پێش نەخراوە، وە ئومەت زەبتی کردووە لە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، ڕێکخستن و تەرتیبی ئایەتی هەموو سورەتەکان لە جێگەو شوێنی خۆیدایە.

کۆڕای تەواو هەیە لەسەر تەرتیبی ئایەتەکان کە تەوقیفییە و، بە یەقین گەیشتووە بە ئێمە بە ڕێگەی موتەواتیر، لەسەر ئەم شێوازی ڕێکخستنە، بەم شێوازە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خوێندویەتیەوە و، هاوەڵانیش بەم شێوازە وەریانگرتووە.

بەڵام بۆ ڕێکخستنی سورەتەکان کۆڕای زانایان لەسەر ئەو ڕایەن، کە بە ئیجتیهادی هاوەڵان بووە.

لەو دەلیل و بەڵگانەش ئەوەیە: ئەو ڕاجیاییە بووە لە نێوان هاوەڵان لە ڕێکخستنی سورەتەکانی پێش کۆکردنەوەی لەلایەن ئیمامی عوسمانەوە، لەوانە (موسحەفی عەلی ڕەزای خوای لێبێت، بەم شێوەیە تەرتیبی کردبوو: یەکەمیان (إقرأ) پاشان (المدثر)پاشان (نون) پاشان (المزمل) پاشان(تبت) پاشان (التكوير)، وەتاکۆتایی بەم شێوەیە، وە مەککی و مەدەنی.

موسحەفی ئیبنو مەسعود یەکەم موسحەفە، کە بەم شێوەیە تەرتیبی کردووە: (البقرة) پاشان (النساء) پاشان (آل عمران).

هەندێک لە زانایان پێیان وایە ڕێکخستنی هەندێك لە سورەتەکان تەوقیفییە، هەندێکی تری بە ئیجتیهادی هاوەڵان بووە.



## سەرچاوەكان:

١- دراسات في علوم القرآن الكريم.

المؤلف: أ. د. فهد بن عبد الرحمن بن سليمان الرومي.

الناشر: حقوق الطبع محفوظة للمؤلف.

الطبعة: الثانية عشرة ١٤٢٤هـ-٢٠٠٣م".

٢- في علوم القرآن دراسات ومحاضرات.

المؤلف: محمد عبد السلام كفافى وعبد الله الشريف.

الناشر: دار النهضة العربيه – بيروت.

٣- مناهج المفسرين.

المؤلف: منيع بن عبد الحليم محمود (المتوفى: ١٤٣٠هـ).

الناشر: دار الكتاب المصرى - القاهرة، دار الكتاب اللبنانى – بيروت.

عام النشر: ١٤٢١ هـ

٤- البرهان في علوم القرآن.

المؤلف: أبو عبد الله بدر الدين محمد بن عبد الله بن بهادر الزركشي (المتوفى: ٧٩٤هـ).

المحقق: محمد أبو الفضل إبراهيم.

الطبعة: الأولى، ١٣٧٦ هـ - ١٩٥٧ م".

٥- المدخل إلى علوم القرآن الكريم.

المؤلف: محمد فاروق النبهان.

الناشر: دار عالم القرآن – حلب.

الطبعة: الأولى، ١٤٢٦ هـ - ٢٠٠٥ م.

٦- "فصول في أصول التفسير.

المؤلف: د مساعد بن سليمان بن ناصر الطيار.

تقديم: د. محمد بن صالح الفوزان.

الناشر: دار ابن الجوزي.
الطبعة: الثانية، ١٤٢٣هـ.
٧- مناهل العرفان في علوم القرآن.
لمؤلف: الشيخ محمد عبدالعظيم الزرقاني
تحقيق: احمد بن علي
الناشر: دار الحديث . القاهرة، - ١٤٢٢هـ - ٢٠٠١م
عدد الأجزاء:٢.
٨.الإتقان في علوم القرآن.
المؤلف:جلال الدين السيوطي.
تتحقيق: حامد احمد الطاهر االسبكي.
الناشر: دار الفجر للتراث - ١٤٣١ هـ - ٢٠١٠م
٩- أصول في التفسير.
المؤلف: محمد بن صالح العثيمين.
الناشر: دار ابن حزم القاهرة - ١٤٣٠هـ - ٢٠٠٩م.
١٠- ناسخ و مەنسوخ.
بەرهەمی: مامۆستا ناسری سوبحانی.
ساڵی چاپ: ١٤٣٧هـ – ٢٠١٦ز.
١١- التعليق على القواعد الحسان المتعلقة بتفسير القرآن.
محمد بن صالح العثيمين،١٤٣١هـ.
الناشر: فهرسة مكتبة الملك فهد الوطنية.



# ناوەرۆك

هەرێمی کوردستانی عێراق
Kurdistan regional - Iraq
Council of ministers

سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی رۆشنبیری ولاوان
بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەگشتییەکان
کتێبخانەی گشتی سلێمانی
بەشی سپاردن

ژمارە :
رۆژ: / /کوردی ٢٧١٩

رئاسة مجلس الوزراء
وزارة الثقافة والشباب
المديرية العامة للمكتبات العامة
المكتبة العامة/ السليمانية
ژمارە: ٦٣٧
بەروار: ١٨/ ٢/ ٢٠٢٠



بۆ/ ناوەندی ڕێنوێن
بابەت / ژمارەی سپاردن

بەپێی یاسای چاپەمەنیی ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٣
ژمارەی سپاردنی ( ١٢٩٠ ) ی ساڵی ٢٠٢٠ تەرخانکراوە بۆ کتێبی ( زانستەکانی قورئان ) کە لە ئامادەکردنی (دانا جەلال سابیر )ە، بە تیراژی ( ١٠٠٠ ) دانە، کە بابەتەکەی ( ئاینی )ە، بە مەرجێك (٥) دانە لە کتێبەکە بۆ بەشی سپاردن رەوانە بکرێت.

لەگەڵ ڕێزماندا


فەرمانبەری بەشی سپاردن

ساکار عەلی عەبدوڵڵا
جێگری بەڕێوەبەر

تێبینی:

١- دەستەواژەی سپاردن بەم شێوەیە لەسەر کتێبەکە چاپ بکرێت، لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردن ( ) ی ساڵی ٢٠٢٠ ی پێدراوە.
٢- هەر چاپخانەیەك پابەند نەبێ بە ناردنەوەی (٥) دانە لە کتێبەکە، ژمارەی سپاردنی نادرێتێ.
٣- ئەم نووسراوە سکان بکرێت ولە دوا لاپەرەی کتێبەکەدا دابنرێت .

وێنەیەك بۆ/
- دوسیەی سپادرن

slemanylibrary@yahoo.com
www.slemanylibrary.com
ژمارەی تەلەفۆن/ ٣٢٠٢٧١٦